دەناڵێنم منی بــێ کەس وەکو مەجنــون لەبو لەیلا
لە کوردســتانا لەشــاری کۆجوانی وانەبو ئەســلا
گوتم نــاوت چییە ئــەی نازەنینی مــن گوتی لەیلا
بەجیلوەیی ڕووی گول ڕەنگت بەجارێ بۆتە گوڵ دونیا
بەنەشئەی قامەتی ســەروت سەراسەرباغ و بوستانە

بەباڵای بەرزی لاولاوت دڵم بۆت شــێت و شــەیدایە
وەکو ئاوێنەیە ڕوی تۆ ســەرم بۆت پڕ لەســەودایە
دڵــم دائیم لەلای تۆیە شــەو و ڕۆژ تــۆم لەدڵ دایە
لەلای باڵات ســنەوبەر لایە باڵای ســەروی دوو لایە
لەبای ڕەشک و ئەسەف هەم قامەتی شمشادو لەرزانە

لە بەزم و کەیف و ئاهەنگ و کەلام و لوتفی شیرینت
لــەداو و زوڵف و ئەگریجەت لەچینی پەرچەمی چینت
(جەمال) حەبســو گرفتارە بــەداوی بەندی زولفەینت
(حوسێنی) وا لەبەزمی گوڵشەنی ڕوخساری ڕەنگینت
وەکو بولبول چریکەی دێ لەدەوری گوڵ غەزەل خوانە

## شیعری حوسێنی
## پێنج خشتەکی جەمال

چاوەکـــەم تاکـــەی بناڵـــم زۆر پەرێشـــانم وەرە
دڵ برینـــدارو حەزینـــم بیکـــە دەرمانـــم وەرە
مـــن گرفتـــاری هەوای تـــۆم زۆر ســـەرگەردانم وەرە
وا بەغمـــەزە جەرگی پڕ خوێن کـــردووم ئەو دولبەرە
نووکـــی موژگانـــی لەبـــۆ دڵ پارەکـــردن خەنجەرە

دڵ نیگەرانـــە لـــەدوری یارەکـــەی گـــوڵ خونچەدەم
شـــیوەن و ئەفغانمـــە هـــەردەم دەناڵـــم چاوەکـــەم
نرکـــە نرکـــم دێ بەدائیـــم عاجـــزم دڵ وا بەغـــەم
تیری غەمزەی هێند بەتاو بۆم دێ لەدویەک دەمبەدەم
سەیری سینەم کەن لەهەرلا کون کونە وەک پەنجەرە

مـــن لەبـــەر بالأیی بـــەرزو ســـینەو و دو زولفەکەی
شـــین و ڕۆرۆمـــە دەناڵم بویمـــە خاکـــی ڕێگەکەی
هەم لەبەر دوو چـــاوی کاڵ و لێوی ئاڵ و کوڵمەکەی
بۆ موســـەخخەرکردنی دڵ پەرچـــەم و ئەگریجەکەی
هێـــرش هێنـــا دەڵێـــی تابـــوورو تیپی عەســـکەرە

وا لەبۆ شـــەهدی ویســـاڵی تـــۆ دەناڵم بـــێ گومان
ســـوک و ڕیسوا بوم بەجارێ من لەناو خزم و کەسان
وا دەســـوتێم من لەبۆ تۆ گیانەکەی شـــیرین زوبان
دووکەڵـــی ئاهـــم دەچێتـــن دەمبـــدەم بۆ ئاســـمان
ئاگـــری دڵ زۆر بەتـــاوە ســـینە عەینـــی مەجمەرە

دەوری گەنجیم وا بەسەرچوو عومرەکەم وا کەوتە لێژ
باســـی دڵداری لەبۆعالــەم مەکە بۆی هــەڵ مەرێژ
وا لەنـــاو بەحـــری هەوایی تۆمە گەلـــێ دووررودرێژ
وا لەدەریای عەشـــقیا کەشـــتی وجوودم کەوتەگێژ
دڵ لەنـــاو ئەمواجی ئـــەو بەحرە میســـالی لەنگەرە

یـــاری بێ بـــاک و مناڵـــە هیـــچ گوناهێکـــی نییە
دڵ ئەمـــەک دارە دیـــارە ســـودی نیـــگاری نییـــە
مـــن لەتـــاوی ئـــەو دەناڵم ســـودی بێگانـــەی نییە
هێنـــدە مەغرورە بەلای مـــن موتڵەقـــەن مەیلی نییە
مـــن فەقیرو بێکەســـم ئەویش پادشـــاهو ســـەروەرە

شـــەرتو پەیمانـــم وەهابی دەســـت لەتـــۆ هەڵناگرم
هەوڵ و کۆششـــمە (جەمال) تاکەی بەوەصڵی شانەبم
یـــا بەمـــردن یا لـــە دنیـــادا بەبـــالای شـــاد دەبم
ئەی (حوســـێنی) قەت مەپرســـە ماجەرای دەردی دڵم
گەر بەتەعداد بێ بنووســـرێ ســـەد هەزاران دەفتەرە

# شیعری حوسێنی
# پێنج خشتەکی جەمال

رومـــەت گوڵی لێـــو ئاڵی لەنێو گشـــتی بەشـــەردا
وەکـــو بولبولـــی باغانـــی هەمـــوو دەنـــەزەردا
دڵ عاشـــق و شـــەیداتە لەدوریـــت لـــە خەتـــەردا
رووی تـــۆ لە جیهەت حوســـنەوە تەعنـــی لەقەمەردا
دندانـــی[1] دوڕت کەســـری بەبـــازاڕی گەوهـــەردا

دڵ وا لەفیراقـــی تـــۆ شـــەپرزەو حەزینـــە
بـــەو دەردە گرفتـــارە شـــەو و ڕۆژ لـــە گرینـــە
شـــادی بکـــە هەرچەنـــدی ڕەقیـــب وا لـــە کەمینـــە
لەفـــزی تـــۆ شـــەکەربارە کەلامـــت شـــەکەرینە
شـــیرینی نوتقـــی[2] تۆیـــە ڕەواجـــی بەشـــەکەردا

ئاشـــفتەی هـــەوای عەشـــقم و پەتام بکـــەن دەرمان
وا دەربـــەدەری تۆمـــە لـــە ســـەحراو و لـــە کێوان
ئـــەم دەردە شـــیفای نابـــێ بەعیلاجـــی حەکیمـــان
تۆ حـــۆری لەنـــاو جەننەتـــەوە هاتـــووی قوربان
میســـلی تۆ نییـــە چونکە لەناو جنســـی بەشـــەردا

ســـەودا ســـەرو دێوانەیـــی تۆم هـــەر وەکـــو گێژم
بۆ وەصڵـــی جەمالـــی تـــۆ وە تاریک بـــووە رۆژم
فرمێســـکی دوچـــاوم وەکـــو بارانـــە دەرێـــژم
وەک زوڵفـــی ســـیاهت ڕەشـــو تاریـــک بـــو رۆژم
لـــەو ڕۆژە کە ئەفشـــان[3] بـــوو زوڵفـــت بەکەمەردا

---

[1] دندان: دان، دگان

[2] نوتق: ئاخاوتن، قسە

[3] ئەفشان: پرش و بڵاو، وەشان

بەو زامە دەناڵێنم و ناپرسی کە چۆنم
ژینم لەفەوتاندایە لەبەر ئێشی دەرونم
بێ قەدرە لەلام ژینو حەیات بون و نەبونم
قوربان وەرە ڕەحمێکە بە ئەحوالی زەبوونم
روحم لەفیراق و غەمی دووریت لەخەتەردا

دڵم سوتاوە بۆت جانا وا کەوتمە نەدامەت
مەسئولی لەسەر دونیا لەبۆ رۆژی قیامەت
بی بەخشە لە گەردونی بەخۆشیوو بەسەلامەت
خەییاتی ئەزەل دوزی[1] لەبازاری موحببەت
ئەم خەلعەتی عەشقی تۆ کە کردوومە بەبەردا

شمشێری دو ئەبرۆت لەشەڕن یاری بەڵەک چاو
زۆر زەحمەتە دەرچم لەغەم دولبەری لاولاوی
موشتاقی دەمی تۆیە (جەمال) بۆ قومێ شەکراو
ئەی دۆستی (حوسێنی) هەموو جەرگی بووە خوێناو
پەیکانی[2] خەدەنگی مژەکەت وەک لە جگەردا

---

[1] دوز: شاڵ، دروو، دوورین
[2] پەیکان: تیر، خەدەنگ

# دودێره شیعری
# شێخ عەبدوڵلای شێخ مستەفای نەقشبەندی
# پێنج خشتەکی شێخ جەمال

سەری ئەم دەورو زەمانەی کەن وەکو چەرخو فەلەک
ئادەمـــی ئیمڕۆ دەچن بۆ مانگ و ئەســـتێرەو فەلەک
بەفرە زریانـــە دەبارێ تـــەزره وەک کوچکو کەلەک
بایەکەی زســـتانی دوری هەر کەهـــات دژ بە گەلەک
وەرگـــەڕا هەر چەنـــدی کـــردم وەرنەگێڕێتن کەلەک

من لـــەدوری تـــۆ حەزینم شـــیوەنو گریـــان ئەکەم
چاوەڕێـــی تۆمـــە لەمێـــژە بیـــری هاتنتـــان ئەکەم
تـــۆی پزیشـــکی دەردەداران لای تـــوە دەرمانەکـــەم
گـــەر بەهـــاری رۆژی دیـــدارت بهێنـــن گیانەکـــەم
لوتدەڵێمکوندەیکەلەکچونکەتنەبەردەمچەندپەلەک

# شیعری زێوەر[1]
# پێنج خشتەکی جەمال

موسڵمانم ئەبێ من بێ زەرەربم
خوداناس و ئەدیبم بێ کەدەربم
ئەبێ دائیم نمونەی ناوبەشەر بم
عەرەق ناخۆم کە توشی دەردی سەربم
گرفتاری هەزار دەردو خەتەربم

حەرامە خوارنەوەی عارەق برادەر
هەتا ماوە ژیانم من سەراسەر
ئەبێ نەی خۆمەوە تا رۆژی مەحشەر
بەئەمری خواو بەفەرمودەی پێغەمبەر
لەمەی نۆشی ئەبێ دائیم حەزەربم

[1] سالی: ١٨٧٥ لەشاری سلێمانی لەدایک بووە، لە حوجرەی مزگەوت خوێندویەتی، عەرەبی و فارسی و تورکی باش زانیوە لەشاری سلێمانی مامۆستایەتی کردووە، زۆر بەرهەمی لەشیعرو چیرۆک بەچاپ گەیاندراون، دیوانی زێوەر لەلایەن مەحموود زێوەرەوە ساڵی ٢٠٠٣، دەزگای ئاراس بڵاوی کردەوە، ساڵی ١٩٤٨ کۆچی دوایی کردووە.

بەیەک ڕەنگی ئەژیم و نابمە دوڕەنگ
ژیانم خۆشە بێ گەردم بەبێ ژەنگ
لەخۆشی دامە دائیم بێ شەڕو جەنگ
هەچی خواحەزنەکا ئەیکەم بەسرڕی
ئیتر بۆ شەرمەزاری ناو بەشەر بم

لە دونیای بێ وەفا تامکینم بێ
دەکەم چاکە شەو و ڕۆژ هەرچی هەم بێ
لەبۆ ڕۆژی قیامەت زۆرو کەم بێ
عەرەق ناخۆم کەعومری کورت و کەم بێ
بەجوانی بۆ گرفتاری زەرەر بم

گوشادم من (جەمال) بۆ چ دڵ بەغەم بم
ئەدیبی شاری کۆیی موحتەرەم بم
لەنەسلی ئەحمەدی خاوەن کەرەم بم
عەرەق ناخۆم کەدووچاری وەرەم بم
هیلاکی خەستەگی قەلب و جگەر بم

بـۆ موسڵمانی خـوانـاس ڕو لـه مـەولاکـردنـه[1]
زیـکـرو فیکرو طـاعـەت و تەسبیح تـەقـوا کردنه
چـانـدنـی چـاکـه بـۆتـۆ شـوکـرو دوعـا کـردنـه
لـەزەتـی دونـیـا بـرادەر پشت لـەدونـیـا کردنه
هـەر غـەمـه بـون و نـەبـونـی ئـاخـریـشـی مـردنـه

دوشـمـن لـه کـوردسـتـانـا هـەر خەریکی پیلانه[2]
نـاکـۆکـی پـەیـدامـەکـەن لـێکـتـرمـەگـرن بەهانه
نـیـشـتـمـان بـپـارێـزن تـالـێـی دەرچـێ بێگانه
بەیەکیەتیوو تەبایی وەک گـەلاوێـژبـن جوانه
نـەکـەن بـڵاوو پـەرتـبـن کـورد وەکـو حەفتەوانه

[1] ئەم تاکە دێرە شیعرە لە سەر داوای مەلا عەبدولقادری بەحرکەیی تەخمیسی کردووە.
[2] ئەم تاکە شیعرە هی مەلا مەجیدی گوێڕی یە، شێخ جەمال کردویەتی بە پێنج خشتەکی.

نیشـــتمانەکەم چـــرای چاوەکەم
روح و گیانەکەم بۆت دەکەم خەبات
لامپای دیدەکەم تۆی ئامانجەکەم
لەبیرت ناکـــەم لەرێگەی نەجات
* * *

لە کوردســـتانا دوژمن دەردەکەم
مـــن فیـــداکارم بـــۆ ولآ تەکـــەم
تاوەکو مردن ژێردەســـتی ناکەم
بەخوێن وەردەگرم مافی گەلەکەم
* * *

نیشـــتمانەکەم بیروباوەڕەکـــەم
قوربانـــی تۆبێ ســـەرومالّەکەم
بەفیـــدای تۆبێ گەلـــو هۆزەکەم
پێشکەشت دەکەم هەردو گلّینەکەم
* * *

ئەم نیشـــتمانە خاکـــی کوردانە
خۆشەویســـتمانە چرای چاومانە
خاکی کوردانە جێگـــەی مەردانە
دوڕو مەرجانـــە زێڕی ڕەشـــمانە
* * *

خۆشەویســـتمانە خاکی خۆمانە
جێـــی باپیرانە تاجی ســـەرمانە
روح و دینمانـــە ســـەرومالْمانە
نـــان و ئاومانـــە وڵاتەکەمانـــە

* * *

ئێمە کە کوردیـــن بەبیرو بڕواین
رزگاری ئەکەین کوردو کوردستان
لەگەڵ یەکتراین هەموو وەک براین
وا لە شۆڕش داین بێ شک و گومان

## شیوەن بۆ
## شێخ عەبدولقادری کاک مستەفای هێران

بـــای ئەجەل بـــردی لەپـــڕ لاوێکی کـــوردی قارەمان
هێرشـــی هێنا لەناکاو زەبری دەســـتی خۆی وەشان

چی بڵێن لەو کارەســـاتە چی بکەیـــن ئەی خزمەکان
نابی لێی بدوێن لەکارو کردەوەی خوای موســـتەعان

نـــاوی مەشـــهور بـــو بەعەبدولقادری کاکـــی هیران
کۆچـــی کرد داخـــی گرانم ئـــەو ئەدیبەی نیشـــتمان

بابناڵێنیـــن لەبـــۆ ئـــەو بابکەیـــن شـــین و فیغان
تف لەدونیای بێ وەفاو جەورو جەفای ئێســـک گران

رۆژی یەک شـــەم بـــو لەدونیادا نەما شـــێخی زەمان
کۆچی کـــرد ڕۆیی ڕوحی بۆ بارەگای خوای گەورەمان

گیانی پاکی هەل فڕی وەک مەل لە بۆ ڕوی ئاســـمان
خزم و کەس دۆســـت و برا نێزیک بۆیمرن لە غەمان

رۆژی دوشـــەم ڕێک کەوت بۆی ترمەکەی چووە هیران
جـــا لەوێ نـــاژرا لـــە گۆڕســـتانی بـــاب و باپیران

وەسیەتی خۆی بو لە شـــیعرا کردبوی باس و بەیان
کاک مـــەلا ثانی بـــرازای بردیـــەوە گونـــدی هیران

ڕاســـپاردەی واکردبـــو تەرمـــی ببەن بـــۆ مەرقەدان
بیبەنـــە لای داکـــو بـــاب و بـــراکان و مورشـــیدان

ئارەزوی پێک هات شــوکر واچووە ناو خزموکەسان
ئاخیــری جێگەی لەدونیا کەوتە حەوشـــی مەرقەدان

پێنــج و دورۆژێکــی تــر ئێمــەش برادەر گشــتمان
دێنـــە لای ئێوە بەجارێ چۆل ئەکەین ڕوی نیشـــتمان

یەعنـــی زاتی پاکی پێغەمبەر ڕەســـولی ئینس و جان
حەزرەتی شـــاهی زەمان و ســـەییدی هـــەردو جیهان

شـــێخ جەمال و ئەنوەر و جەمعی ئەدیب و شاعیران
گشـــتیان داوا ئەکەن هەردەم لەخودای کەونو مەکان

خوایە برژێنیتە ســـەر شـــێخ قادری شـــیرین زوبان
ڕەحمەتـــی پــڕ نیعمەتت بـــۆ خاتـــری پێغەمبەران

پڕ بەدەم هـــەردەم ئەڵێین ئەی کـــردگاری بێ مەکان
خۆشـــبی لێی ئازادی کەی بۆ خاطـــری مولای جیهان

## شیوەن بۆ شێخ مەزهەر[1]

برایـــان مـــردن دەرمانـــی نییە
کەڕووی تێ کـــردی ئەمانی نییە

ئەوەی گیانی سپارد جیهانی نییە
تاکو قیامـــەت ژیانـــەوەی نییە

ئەگەر دەپرسن روح چۆنە و چییە
بێ شـــک تەفســـرو بەیانی نییە

خوا نەبێ چ کـــەس ئاگادار نییە
لەزانینـــی روح خەبـــەردار نییە

لەشەوی نۆزدەی مانگی ڕەمەزان
ڕۆژی جومعە بـــو لەکاتی بەیان

داخی گرانـــم کاکـــە مەزهەرمان
کۆچی کرد ڕۆیی لەسەر ڕووی جیهان

لەشـــاری کۆیێ هاتبـــوە دونیا
لەهەولێـــر خودا بردیـــەوە فەنا

ساڵی ســـیووپێنج لەدایک بووە
لەنەوەدوســـیش کۆچی کردووە

---

[1] شێخ مەزهەر: شێخ مەزهەر کوڕی شێخ صەدرەدین)ە ئامۆزای شاعیرە، ساڵی ١٩٩٣ کۆچی دوایی کردووە.

پەنجا و هەشت ساڵ بو لەدونیا عومری
بـــەرزو بەڕێـــزو حورمەتـــو قەدری

گەردەنی خوایە خۆش و ئازادبێ
ڕۆژی دوایی بەبەهەشـــت شادبێ

تەمەنـــی درێژی بـــۆ برایەکانی
بۆ کـــوڕو کچ و بـــۆ خزمەکانی

هـــەزاران ســـەلام لەڕوحی پاکی
لەئالـــو بەیتـــو لەبـــاب و داکی

لەو کەسانەش بێ لۆی بەپەرۆشن
غـــەم و پەژارەی لەبۆ دەنۆشـــن

(جەمال) لەبۆ ئـــەو دڵ بریندارە
لەتـــاو مەرگی ئـــەو وابێ قەرارە

بەڕەحمەت خـــودا بیبا بۆ جینان
لای باپیری خۆشـــای ئاخرزەمان

## شیوەن بۆ شێخ کاکە[1]

خزمـــان بڵێـــن ئیمڕۆکـــە چ قەومـــاوەو چ ڕوی داوە
چییە ئەم شـــین و گریانـــە لەئازادی کـــە ڕوی داوە

چییـــە ئـــەم هاتوهـــاوارە لەخۆدانە لەگشـــت لاوە
لەهەر لا سەیر ئەکەم شـــێواوە عالەم ڕەنگی گۆڕاوە

هەراو و دەنگە زریکانە ئەڵێی مەحشـــەر هەڵســـتاوە
گوتم کێ مردووە دیســـان کەمیللەت بۆی خرۆشـــاوە

لەناکاو یەک بەغار هاتو بە ئەســـپایی لەدەرگەی دا
کـــە دەرگام کردەوە هاواری بۆ هێنـــام لە نەعرەی دا

چریکانـــدی بەهـــەردو دەس لەئەژنـــۆی و لەڕانی دا
گوتم چیت بیســـتوە دەرویش لەگریەو ئاهوناڵەی دا

گوتی شـــێخم وەفاتی کرد حەیـــف رۆیی خودا نەی دا
گوتـــم چ بکەین؟ گوتی خێرا لەگریـــان و لەڕۆڕۆی دا

لەتاو ئـــەم زاتە نازدارە هەموو کردمـــان بە واوەیلا
حەیف ئەم شـــێخە ناودارە بەجێی هێشتین لەدونیاوە

لەبۆ قەومی لەنێو سادات قەڵات و قەسرو سەنگەر بو
هەتا مـــردن لەبیر ناچێـــەوە جەنابـــی لەبەر چاوە

---

[1] شێخ کاکە: ناوی شێخ مستەفایە کوڕی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورمایە، کە لە ٢٠٠٣ کۆچی دوایی کردووە.

## شیوەن بۆ شێخ ئەنوەر[1]

هەوری ڕەش و نیگبەتی وا هاتە بەر ڕوی ئاسمان
هاتــەوە دیسان لەبۆمە شین و گریان و فیغان

لە رۆژی پێنج مانگی دوازدە کۆچی ئەنوەر بو بەیان
ماڵ ئاوایی کرد لەهەولێر لای هەموو خزموکەسان

با بگرین و دەسـا با شیوەنێ بـۆی بەرپا بکەین
بـا بچێژین دەردی دوری بـا غـەمـی بـۆ داگـریـن

بولبولی بـاغـی گـوڵـم فێنکی دڵـم بـۆ کـێ فڕی
تـازە نـای بینینەوە بێ شک هەتا ڕۆژی موبین

کوانێ دەنگە خۆشەکەی کوا خوێندنی قورئانەکەی
شاعیرو و زاناو زەکی بو سەیدی سەرڕوی زەمین

چی بڵێم هەرچی بنوسم دەرحەقی ئەو هەرکەمە
خەڵکی هەولێرێ سەراسەر ماتوغەمگین و حەزین

خوایە ڕەحمی بێ بکەی بۆ خاتری پێغەمبەری
خۆش ببی لێی ڕۆژی مەحشەر یا ئیلاهەلعالەمین

[1] شــێخ ئەنوەر: کوڕی ســەید ئەحمەد کە بەحوســێنی ناسراوە کە لە شــاعرێکی کلاسیکی گەورەیە، شــێخ ئەنوەر لەســاڵی ١٩١٩ لەکۆیە هاتۆتە دنیاوە برای شێخ جەمالە شێخ ئەنوەر شاعرێکی کلاسیکی بەتوانایە بەشێک لە شیعرەکانی بەناوی دیوانی شێخ ئەنوەر لە ٢٠٠٩ بەچاپ گەیاندراوە لە ٢٠٠٦/١٢/٥ کۆچی دوای کردووە.

# شیوەنێک بۆ شەهیدان

ئەو شـــەهیدانەی خۆیان فیداکرد
شۆڕشی حەقیان لەڕێی خوداکرد

واجبی گەلیـــان پەرتی دونیاکرد
لەبۆ کوردستان خۆیان بەخت کرد

بەم شەهیدانە قەت مەڵێن مردوون
هەتـــا قیامـــەت نامـــرن زیندون

مردوی زیندونە لەمێژوی بەشەر
ناو و خەباتیان خرایە ناو دەفتەر

بەخوێنی گەشـــی پێشمەرگەکانە
ئێســـتا خاوەنی دیـــن و ئیمانە

بمرێ خیانـــەت دو دڵی و نیفاق
لەکوردســـتان و لەخاکی عێراق

برای بەڕێـــزی ئـــازادی خوازان
بەچکە شێرانی کورد و کوردستان

ئیتـــر بەوەنـــدە ئیکتیفـــا دەکەم
بۆ سەر بەخۆیی هەر شۆڕش دەکەم

## شیوەن بۆ ئەنوەربەگ[1]

لەنـــاو بێتواتە شـــین و ڕۆ ڕۆیە
دڵی خزمـــەکان پڕ لـــە برین بو

میرانـــی ئەنـــوەر وەفاتی فەرمو
دڵمان پر خوێن و جگەر کون کون بو

بەرانبەر دوشمن چەشنی پۆڵا بو
بۆ خۆشـــناوەتی وەکـــو ئاڵا بو

بەمیوان داری گەلێ مەشـــهور بو
لەم کوردســـتانە گەلێ ناندەر بو

لەکوردســـتانا پشـــت و پەنا بو
دیوانی جێگەی شـــاهو و گەدابو

تێکۆشەرێ بو ڕەئیس عەشیرەت
پیاوێکی گەورە سەخي طەبیعەت

خوایە گەردەنی خۆش و ئازادبی
ڕۆژی قیامەت بەجەننەت شادبی

عومـــری درێـــژی بـــۆ کوڕەکانی
بـــۆ براکانـــی بـــۆ خزمەکانـــی

---

[1]ئەنوەر بەگی بێتواتە لە ١٩٩٢/٩/٢ کۆچی دوایی کردووە.

شـــوكر بۆ یەزدان ئەنوری میران
جێگەی چۆڵ نییە ڕەشیدی میران

ئەولادەكانـــی لەم كوردســـتانە
زۆر خۆشەویستن لەم نیشتمانە

قەبرەكـــەی خوایە ببیتە جەننەت
بیبەیتە بەهەشـــت ڕۆژی قیامەت

لەدوی مانگی نۆ لەبۆ سەفەرچو
مێژوی زاینی و كۆچی بۆ دەرچو

(جەمال) بەرزنجی بۆی بێ قەرارە
لەتـــاو كۆچی میـــر دڵ بریندارە

## شیوەن بۆ مەلا عەبوڵلا[1]

دوبـــارە ئـــەوا لەشـــكری غـــەم هێرشـــی هێنـــا
تـــا زەبـــری دەســـتی دانەوەشـــاند وازی نەهێنـــا

بیستومە كـــەوا عـــەبـدی خـــودا ڕۆیـــی لـــەدونـیـا
لێی خـۆش ببی خـودای گـەورە لەدنیاو لەعوقبا

لـــەڕۆژی سێ لە مانگی سێ لە دونیا كۆچی كرد
لـــەسـاڵـی دوهـــەزارو شـــەش بـو كـــەوەفـاتـی كرد

خەڵكی هەمو شـێـواوە لـەتـاو مـەرگ و وەفاتی
ئـــەو عـالـــەمـە دامـــاوە لـــەبـــەرزاتـــو صیفاتی

وادیـــــارە خـــەتـیـبـەكـــەمـان زۆرە كـــەلامـــی
مـــەعـلـومـە لەعیلم و ئـــەدەبـا بـــەرزە مەقامی

بیبەخشـــی بـــە پێغەمبـــەری خۆت ســـەییدی عالەم
لەو ڕۆژی كەوا حەشـــری دەكەی گشـــت بەنی ئادەم

(جەمال) مێـــژووی بۆ دانـــا خودا بیبەیـــە جەننەت
بەكەیفـــی خۆی دڵی شـــاكەی تـــا نەبینـــێ زیللەت

---

[1] مەلا عەبدوڵلا شەریف خەتیبی مزگەوتی ماجدی بووە لە٢٠٠٦/٣/٣ كۆچی دوایی كردووە.

## شیوەن بو
## حمەزیاد ئاغای غەفوری[1]

غەفـــوری زادە کاکە زیـــاد پیاوە بەرزەکـــەی کۆیی
لەشـــاری نەغـــەدەی گیانی ســـپاردو حەیـــف ڕۆیی

پیاوێکـــی بەڕێزو بـــەرز و گەورە بـــو وەتەن پەروەر
لە دانیشـــتوانی کۆیێ بو لەبۆ کورد ســـایەو سێبەر

لـــە هەولێـــر و دهۆکو شـــاری کرکوک و ســـلێمانی
لەهەر  چوار شـــارەکان هەیبو بێشک عیزەتو شأنی

هێـــژاو یەقەدرو قیمـــەت بو هەتا کۆچـــی دوایی کرد
چـــرای ڕۆناکی گەل بو لەڕێـــی ڕزگاری قەومی کورد

وەک ئەســـتێرەیەکی گەش لەخاکی پاکی کوردســـتان
لەشـــۆڕش بـــوو ئەوزاتـــە بەبیـــرو بـــاوەڕو ئیمان

هەتـــا ماڵئاوایی کـــرد لەدونیـــا عومـــری کۆتا بو
لەکۆیـــێ نێژرا تەرمـــی غەریقی ڕەحمەتـــی خوا بو

---

[1] حمەزیـــاد ئاغـــای غەفوری: حەمەزیاد کوڕی حەمە ئاغای مەحموود ئاغای غەفورییە، کەســـایەتیکی نیشـــتمان پەروەرو ناســـراوی شـــاری کۆیەیە، لەخەباتی کوردایەتی دا بەشـــداری جموجۆلی سیاسی کردووە، کۆمەڵەی لاوانی دروســـت کرد لەگەڵ رەشـــید عارف، صابر اسماعیل حمد، مستەفا خۆشناو، عوســـمان عەونـــی، زەکـــی هەناری، طاهر صـــادق، ئەندامی حزبـــی هیوا بوو، جێگـــری دووەمی حزبی دیموکراتی کوردی (کوردســـتانی) بوو، لەســـاڵی ١٩٤٧ بۆ ئەندامی پەرلەمانی عیراق هەڵبژاردرا، ساڵی ١٩٤٨ وازی لێ هینا لەبەر پەیمانی پۆرتسمۆس، لەساڵی ١٩٩١ کۆچی دوایی کردووە.

# شیوەن بۆ
# شێخ مەعروفی هەرەجە[1]

کە شێخ مەعروف وەفاتی کرد، دڵ و جان پڕ لەماتەم بو
لە بەخشینو سەخاوەت ئەو گەلێ زیاتر لە حاتەم بو

عەزیزو موحتەرەم بو شێخ لەنەسلی شاهی خاتەم بو
لەئالی ئەحمەد و یاسـین محەممەد فەخری عالەم بو

لەجەرگـی فاطمەی زەهراو حوسـێنی لاوی ئەغلابو
لەناو کوردو لەکوردسـتان مەقامی شـێخی ئەعلا بو

کـوڕی عەبدولکەریمی بو ئەویش خاوەن کەرامەت بو
لە ئیرشـادو طەریقەتـدا وەلی دونیـاو قیامەت بو

هەرەجـە گوندو سـوکنا بو مەکانی شـێخی باڵا بو
بەدائیـم تەکیەکەی پڕ بوو لە عالەم جێی سـکاڵا بو

لەبـۆ حەلی مەشـاکل زیرەکـو هۆشـیارو دانابو
رەفیقـی کەم بـو ئەوزاتـە بەمەعلوماتـو زانا بو

رجالـی دینـو دونیابـو غەریقی ڕەحمەتـی خوابو
چووە لای جەددی خۆی ئەحمەد بەباغی جەننەتی شابو

[1] شێخ مەعروف: کوڕی شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی یە، دانیشتووی گوندی هەرەجەیە، لەساڵی ١٩٣٠ کۆچـی دوایی کردووە، شـێخ مەعـروف زانایەکی ئاینی بەتوانا بووە، هەمـوو دەم تەکیەکەی پڕ بووە لە میوان، لەشـارو دێ لەنێوساداتی بەرزنجە ئاماژەیان بەرێنماییەکانی دەکرد، چونکە زۆر هۆشیارو زرینگو زیرەک بووە.

وەکو مەل هەلفری روحی لەعەرشـــی وەحدەت ئاوابو
هەزار ڕەحمـــەت لە گۆڕی بێ لەدونیا عومری کۆتابو

هەموو دەم مـــل کەچی ئەمرو کەلامی خوای تەعالا بو
(جەمـــال) بۆیـــێ لەمێژوویدا ئەڵێ شـــێخیمە ئاڵا بو

جەنابی شـــێخ وەفاتـــی کردو چو مێوانـــی مەولا بو
لەنـــاو گەلـــدا نەما ڕۆیی شـــیعارو ڕەمـــزو ئالا بو

## شیوەن بۆ شێخ لوتفی[1]

لەرۆژی بیســـتی شـــەوالی هەزارو چوارصەدو نۆبو
جەنابی شێخ لەتیف کۆچی دوایی کرد بەڕەحمەت چو

لەدانیشـــتوانی کەرکووک بو گەلێ پاکو مونەوەر بو
لەنێـــو ئەم شـــارەدا پیـــاوێ بەدینو بیروبـــاوەڕ بو

لە شـــەرعو دینی ئیســـلامی زیرینگو ژیرو هوشیاربو
لەشیعرو وێژەو هەڵبەست دا زوبانی دولبەرو یار بو

لەبۆ ڕێـــی ژینـــی ئـــازادی گوڵێکی نیشـــتمانی بو
لەبـــۆ بـــەرزی وولاتیشـــی خەریکی بەختیـــاری بو

حەیف نەی دیت بەچاوی خۆی ئەوەی فکرو مەرامی بو
ئەجەل هات بۆ روحی پاکی شـــەهادەت دوا کەلامی بو

ئەهالی گشت ڕەحیماوەی ســـەراپا شێت و شەیدا بو
بەجارێ شـــین و واوەیـــلا لەبۆ ئەم زاتـــە پەیدا بو

وەفاتی کرد ئەوا لوتفی لە نەســـلی شاهی خاتەم بو
لەنێو ســـاداتی بەرزنجی سەخی بو عەینی حاتەم بو

لەبۆ قەوم و کەس و کاری وەکو ڕەشمال و سێبەر بو
لەناو کۆمەڵ لە کوردســـتان ئەوا ڕۆیشـــتو تێپەڕ بو

مەکانـــو مەرکـــەزو جێگـــەی بڵنـــدو بـــەرزو باڵا بو
لەنێـــو عالەم دیاربو ئەو شـــیعارو ڕەمـــزو ئاڵا بو

---

[1] شێخ لوتفی شێخ ڕەزای بەرزنجی لە١٩٨٩/٥/٢٣ وەفاتی کردووە.

زوبانی کوردی و تورکی و عەرەبی هەم فارســـی زانبو
بەڵێ هەر چـــواری زانیوە چراو فانۆســـی کوردانبو

قســـەی وەعزو نەســـیحەتبو بەنرخ و قەدرو قیمەتبو
رەفیقی کەم بو ئەم زاتـەـە لەنێو خەلقی بەحورمەتبو

حەسەن شـــاهی گڵە زەردە کە ئەو باپیرە گەورەی بو
هەتـــا کۆچی لەدونیا کرد قەناعەت کارو پیشــەی بو

لەئیرشـــاد و طەریقەتدا خەلیفەی غەوســـی بەغدا بو
مەلاو شـــێخو ئەدیبیش بو هەزاران شـــیعری دانابو

لەگەڵ شـــەیتان و نەفسیشی هەمو کاتێ لەجەنگا بو
گەلـــێ ئایاتی قوران و حەدیسیشـــی لە ســـینگا بو

زوبانـــی حالـــی (الحمدولاالضالیـــن) و ئامیـــن بو
کەلامی خواو حەدیســـی حەزرەتی طاها و یاســـین بو

لەبیست وسێ لەمانگی پێنج غەریقی ڕەحمەتی خوا بو
پڕی ناو قەبرەکەی نور بێ بەباغی جەننەتێ شـــا بو

خـــودا ڕەحمی بەلوتفـــی کرد بە دینو بیـــرو زانا بو
ماڵئاوایـــی لەدونیـــا کـــرد ژیانو عومـــری کۆتا بو

(جەمال) مێژووی لەبۆ داناو دەڵێ شێخیمە لوتفی بو
خودا لێ ی خۆش بو لەو زاتە کەلام و الله ئیمامی بو

وەکو مەل هەلفڕی ڕووحی لەبۆ فیردەوســـی ئەعلا بو
لەبۆ لای جەددی خۆی ئەحمەد لەوێ مێوانی مەولا بو

# شیوەن بۆ
# شێخ عەبدولقادری[1]مستەفای هێرانی

ئەی مەرگ هەرتۆی زەمین تار ئەکەی
جگەر لەتەلەتو بریندار ئەکەی

بەشەر عاجزو دڵ غەمبار ئەکەی
کارەساتێکی بێ شومار ئەکەی

عالەم لەژینی خۆی بێ زار ئەکەی
تاکو قیامەت هەردەم کارئەکەی

براو خزم و کەس پەرێشان ئەکەی
منداڵ هەتیوو سەرگەدران ئەکەی

عالەم بەجارێ هەراسان ئەکەی
رۆژێ هەزاران ماڵ وێران ئەکەی

شاهو گەدایان بێ سامان ئەکەی
گشت روح لەبەران بێ گیان ئەکەی

لەرۆژی یەک شەم سەعات کاتی دوو
بابەغەوسمان وەفاتی فەرموو

لەتەکیەی ماوە تابەیانی زوو
شەوێ مێوانی مەلا ثانی بوو

---

[1] شێخ عەبدولقادر کوڕی صافی شاعیر بووە، ناسراوە بە کاکە غەوس لەشیعریشدا نازناوی (سۆزی) بووە لە ١٩٩٠/٥/٢٠ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

رۆژی دوشەمۆی سەرلەبەیانی
بردمانە هێران سەرقەبرسانی

بۆ سەر ئەشکەوتی شێخ سولەیمانی
ناو گۆڕستانی باپیرەکانی

لەبۆ نێژرانی لای خزمەکانی
لای کاک عەبدوڵڵاو صافی هێرانی

بەدەف لێدان و شوکرانەی باری
بەناڵە ناڵو گریان و زاری

نێژرا جەنازەی لای کاک ئەنوەری
برا گەورەی خۆی و کاکە جەعفەری

ماڵ ئاوایی کرد لەناو خزمەکان
لەمەلاو شێخ و ئاغاو بەگزادان

غەوسەی عەزیزو خۆشەویستم ڕۆ
پوورزای بەقەدرو بەقیمەتم ڕۆ

ئەدیب و زانای نیشتمانم ڕۆ
نازناوی (سۆزی) شاعیرانم ڕۆ

پیاوی ناسراوی زۆر ئەمینم ڕۆ
عەبدولقادری زۆر بەدینم ڕۆ

(جەمال) لەیەزدان ئەپاڕێتەوە
دەرگەی ڕەحمەتی بۆ بکرێتەوە

وەسیەتی (سـۆزی) بەشـیعرو زوبان
ئەمەبـو جێم کـەن لـەلای باپیرەکان

نەجاتـی بـو لەنـاو دەردو غەمـان
پێی بەخشـی خوایە جێی ئەمـن و ئەمان

وا غەوسـە بەڕەحمـەت چـو لەناومـان
بـووە مێوانی صافی و شـێخ سـولەیمان

## شیوەن بۆ
## بابە کەریمی ئامۆزام[1]

ئامــۆزای شــیرن بابـــە کەریــم گیان
خۆشەویســـتەکەی گەلـــی کوردســـتان

رۆژی بیســـت و نۆ مانگی سێ ی نیسان
کۆچـــی دوایـــی کرد لـــە کاتـــی بەیان

تەرمەکـــەی نێــژرا لەنێــو گورســـتان
لەدەروێـــش خـــدر لەنـــاو مەرقـــەدان

ئاگـــری بـــەردا دڵ و دەرونمـــان
لەتـــاو کۆچی ئـــەو بەربوینـــە گریان

ولات پەروەربـــو لەبـــۆ نیشـــتمان
لەخەباتـــا بـــو بـــە هەمـــو دەمـــان

هیچ خۆشـــی نەدی لەسەر ڕوی جیهان
لەداگیرکـــەرو لەدەســـت دوژمنـــان

خوایە لێـــی خۆش بی بیبەیـــە جینان
بۆناو بەهەشـــتی جێی ئەمـــن و ئەمان

[1] بابەکەریم کوڕی شـێخ صەدرەدین)ە، ئامۆزای شـێخ جەمالی شـاعیرە، لە ساڵی ١٩٧٦ کۆچی دوایی کردووە.

تەمـــن درێــژی بـــۆ برایەکانـــی
بـــۆ کاک ســـرودو بـــۆ خزمەکانـــی

ژیـــان ئەوهایـــە ئەڕۆیـــن هەمومـــان
نامینێ هیـــچ کەس بێ شـــک و گومان

مێــژوی کۆچی تۆی دانا بـــێ گیرمان[1]
ئامۆزات (جەمـــال) لەســـایەی یەزدان

[1] گیرمان: بێ دودڵی، بێ تردد.

## نامەی (هەوری)
## بۆ شێخ جەمال

بـۆ خزمـەت مامـی زۆر خۆشەویسـتم خاڵە شـێخ (جەمـال)ی بەڕێز پێشـەکی دەسـتەکانت ماچ دەکەم، عەرضی دوعاو سـەلامم هەیە لەخزمەتی بەڕێزتان داوا لە خودا دەکەم، هەردەم ساغ و سەلامەت بی ئەگەر پرسیار دەفەرمووی ئێمە ئەلحەمدوللا هەموو خزمان بەگشـتی چاکین. مامی بەڕێز ئەگەر دەتوانی پارچە شـیعرێک لە ٧ یا ٨ بەیـت زیاتر نەبێ دەربارەی ستایشـی (شـێخ محیەددینی کەرکـوک بڵێیت، چونکە بەنیازیـن ژیاننامەکەی شـێخی ناوبراو چاپ بکەین من خـۆم قەصیدەیەکی ٩ بەیتیم وتووە، حەزدەکەم جەنابیشـت شتێ بنووسی لەگەڵ یەک وێنەی خۆتا بەدەستی کاک مەصعەب دا بۆم ڕەوانە بکەی بەڵام بەر لە جەژنی ڕەمەزان ئێتر حورمەت.

(هەوری)
شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی- گڵەزەردی
٢٠٠٧/٩/٢٤

## وەڵامی شێخ جەمال بۆ هەوری[1]

هەوری غەم تاریکی کردووە ئاسمان و سەرزەمین
هاتەوە بۆ ئێمە دیسان شیوەنو زاری و گرین

دەستی بیباکی ئەجەل هاتو لەپڕ زەبری وەشاند
گیان و دڵ سوتا بەجارێ بو بەگڵپەی ئاگرین

شیخی کەرکوکی ئەڵێن ئەمڕۆ وەفاتی کردووە
پاشی محیەدین لەتەکیە چی بکەین بۆ کێ بچین

مەسجیدو محرابەکەی داخی گرانم بێ کەسە
چۆلە ئەڕۆ تەکیەکەی ساداتی ئالی طاهرین

کوانێ حەڵقەی ذکری الله کوا دوعاو کوا ثنا
وا بەرەو ڕوخان ئەچێ جێ ذکری یەزدانی مەتین

چی بڵێم هەرچەند لەوەصفی ئەو بنوسم نا برێ
مەردی دونیاو ئاخیرەت پیاوەکی دلپاک و ئەمین

ساڵی تأریخی وەفاتی ئاشکرا (جەمال) ئەلێ
بولبولی سەرچڵ فڕی زووگەییە فیردەوسی بەرین

---

[1] شێخ محیەدین کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیە.

## بۆ شێخ جەمال[1]

بۆ خزمــەت بەرێز خاڵە شــێخ جەمال
پیــری نوورانی ئــەی خــاوەن کەمال

زۆر رێزم هەیەو دەســتت مــاچ دەکەم
بەهیــوام تووشــت نەبــێ ژینــی تاڵ

یاخوا هەمــوو دەم هــەر بەختەوەربی
دوژمنــت دائیــم شــەپڕزەو عــەوداڵ

دوور بــی لەشــەڕی پیاوی نارەســەن
بــڕژێ بەســەرت لوتفــی زوجــەلال

ئازیز ئەگەر توویش پرسیارمان دەکەی
چاکیــن هەموو لا گشــت مــاڵ و مناڵ

داواکاری یەکــەت بەســەر دوو چــاوم
وابــۆت دەنێرم هــەر بە بای شــەماڵ

لــەوەیــە ســودی لــێ وەرگــری تۆ
مێشک و هەستی پێ ببێ خۆشحاڵ

[1] شــێخ جەماڵ نامەیەک بۆ هەوری شــاعیر دەنێرێ داوایِ کتێبی (السادات البرزنجیە)ی لێ دەکات کە ساڵی ١٩٥٦ شێخ عەبدولقادر محەمەد بەرزنجی بەچاپی گەیاندووە، هەوری شاعریش نامیلکەکەو ئەم شیعرەش بۆ شێخ جەمال ڕەوانە دەکات.

نامیلکەیەکی پیرۆزو چاکە
مرۆڤ دەخاتە ناو دەریای خەیاڵ

خاڵە ببورە گەر درەنگ گەیشت
(هەوری)[1]هەمیشە پەشێوەو سەرقاڵ

[1] هەوری: ساڵی ١٩٤٤ لەگوندی کەڵوری سەربەناحیەی پردێ لە پارێزگای کەرکوک لەدایک بووە، خوێندنی سەرەتایی خوێندووە، بەڵام خۆی بە خوێندنەوەی سەرچاوەی ئەدەبی هەمەچەشن پەروەردە کردووە، شیعری کلاسیکی و نوێخوازیشی هەنە، دیوانی شیعرەکانی ساڵی ٢٠١١ لەهەولێر بەچاپ گەیاندراون.

## نامەی ئیبراهیم (برژاو)[1]
## بۆ شێخ جەمال

بۆ برای بەڕێز کاکی جەمالم
ئەم دی جارێ تۆ پرسی هەواڵم

ئێمە لای خۆمان کۆنە خزم بوین
یاری شەوانی بەزم و ڕەزم بوین

لەبیرت ماوە ڕێککەوتەی جارێ
خورماو ڕونمان خوارد لە ڕۆخ ڕوبارێ

هەرچەند ڕێگامان دوورو ئەزیەت بو
بەڵام خۆراکمان زۆر بە لەزەت بو

دێتەوە یادت شەوی گۆمەشین
لەژووریکی تەنگ پێکەوە نووستین

سەلکە بزۆتی دوکەڵی لەعین
چاوی هێنانە فرمێسک و گرین

لێفە شڕەکەی بێ خەفو نوینْ
لەپشتی دەرگا حەپەی سەگ وەڕین

---

[1] بۆ برای بەڕێزم کاک جەمال: پاش سڵاو هەوال پرسین، شەوێک لەشەوان خەوم لێ زڕکابو وەک چۆلەکەی هێلانە ڕوخاو کەوتبونە خەیاڵاتی دنیای بێ ئەنجام بەسەر شاخ و کێوەکان و دەست و دەر ئەسورامەوە، لەپڕ ئەو سەفەرەی من و تۆم هاتە خەیاڵ، گوتم بۆ نەیکەم بەشیعر بۆ کاک جەماڵی بنێرم، ئەوە شەوە هەر لەخەیاڵات بوم بۆ بەیانی هەستام دەستم دا قەڵەم و دەفتەر هەتا نیوەڕۆ ئەو هۆنراوەیەم بۆ نوسی بۆ یادگار، تابێتە یادگار پاش مردنمان تکایە لات بابمێنێ ئاگاداری بکە چونکە لای من جێگا نییە خانەوێرانم، ئەگەر هیچ کەم و کورتیەکی هەبو ئەبێ ببوری، وەبرام ماڵی ئێوە پێ نازانم دەنا جار بەجار دەهاتمە لات وەماڵی کاک ئەنوەریش پێ نازانم. برات ابراهیم برژاو ١٩٤٣/٦/٨.

لەپاشان هەڵسابن ڕو لە دەشت و چۆل
تەکان بەتەکان بۆ ڕەسوی بسکۆل

لەویش ماینەوە تاک و بەیانی
ماڵیان ئاوابی گەل نان و خووانی

کەوتینە ڕێگا بەرەو هەرەجە
هیلاکو ماندو پێڵاومان کەچە

بۆ ڕۆژی دوایی هاتینە هەولێر
تاکو دامەزرێن خوا بیکا بەخێر

کارمان بۆ نەبو هەردوک ڕەنجەڕۆ
دەستێکمان لەپاش یەک لەسەر ئەژنۆ

بەرام زۆر شتم لەبیر نەماوە
دەفتەری شیعرم هەموی فەوتاوە

چەرخی زەمانە وای بەسەر هێنام
شیری منداڵی لەدەم دەرهێنام

لانەکەی ئێستام وەک بەندی خانە
کونە کۆریتی جێگای سەگانە

وەک شەوە کوێرە وەک قومقومۆکی
شەوم روناکی ڕۆژ لە تاریکی

چەقەل و گورگ بەخانەم فێربون
سەگ و مام ڕێوی بەماڵم تێربون

نازانـــم دەردم چـــۆن هەڵبڕێـــژم
لەدەســـتی گـــەردون بێ هـــۆش و گێژم

هەتا هەوری ڕەش ئاســـمان داپۆشـــی
ناگەینـــە ژینـــی پڕ شـــادی و خۆشـــی

مومکینـــە بڵێـــی خـــاوەن زۆر کەســـە
هەمـــووی تەرەســـە فلوســـیان بەســـە

شـــەرەفو نامـــوس بەپول ئەفرۆشـــن
لەباتـــی مانـــگا ماکـــەر ئەدۆشـــن

گشت ســـودی ئەوێ لەپێســـتی چەورم
تاکـــو بیفرۆشـــن لەبـــازاڕ کـــەورم

نێزیـــک ترین کەس لای خۆشەویســـتم
بەهەمـــوو توانـــای دژی هەڵوێســـتم

نیشـــتمان پـــەروەر لایـــان گارەیـــە
دیـــن و ئیمانیـــان هـــەر بـــۆ پارەیـــە

هەنـــدێ لەوانـــە لێمـــان لالوتـــە
ئەڵێـــن نەگبەتـــە ئـــەم ســـەیدە ڕوتە

سەرشۆریو کڕنۆش قەت بۆ کەس نابەم
لەڕێـــی پیاوەتـــی هیـــچ کات لانادەم

ئەوجـــا بزانـــە چـــۆن وەفـــادارم
هەرچەنـــد لـــەڕۆژگار زۆر نالەبـــارم

لەبیرم ماوە دۆڵمەو شێخ مەحشی
سەلکە گۆشتی زل پڕی ناو ترشی

ڕێزو سڵاوم بۆ کاک ئەنوەری
سەیدی سادات نورو جەوهەری

ئەوەم بۆ ناردی بۆ بەڵگەی مێژوو
لەدەستمان دەرچوو ئەوانەی پێشوو

ئیتر سڵاوم بۆ تۆ خێزانت
لە برادەرو گشت و ئەزیزانت

دەبا نووسینمان لێرە کۆتابێ
ئەو هۆنراوەیەم لەلای خۆتابێ

## بەم شێوەیە شێخ جەمال
## وەڵامی برژاوی شاعیری داوەتەوە

مەیدانت دامێ جوابت دەمەوە
سەیدە فەقیربووی واحەسایەوە

ژینی خۆش بەختیت بۆ گەڕایەوە
دۆلارت زۆرە پێ گەشایەوە

لەسەر من قەسبەی قۆڕت کردووە
لەنێو هەندەران بڵاوت کردووە

تۆ دەڵێی منت دەعوەت کردووە
لەجیاتی برنج بامیەت کردووە

بامیەی کرماوی و کۆنەت کردووە
بۆ ئیلهاکی دێو چاکەت کردووە

تیر ئەگەر دەرچوو لە نێو کەوانێ
ئینسانی عاقڵ دەبێ بزانێ

ناگەڕێتەوە لات بەهاسانی
ناز ناوت برژاو عالەم ئەزانێ

شەوان لەکۆشکێ تەدبیرمان ئەکرد
باسی سەیران و سەفەرمان ئەکرد

من و تۆ چەند کەس سەفەرێکمان کرد
سەردانی دۆڵی ئەسحابانمان کرد

لەبیرت ماوە هونەرەکانت
عەبا ڕەشەکەی کاتی شەوانت

سەیران و خۆشی ناو ڕەزەکانت
سەرگردو کێو و ڕوبارەکانت

چیرۆکی دیکەم گەلێ لامایە
ڕابواردنی تۆم چاک لەبیرمایە

گەر واز نەهێنی قەسەم بەو خوایە
بۆت بڵاودەکەم ئومێدم وایە

برادەر دونیا زۆری نەماوە
زۆر بێ زەخیرەی ژینت کەم ماوە

لەتۆبە کردن ڕێ نەگیراوە
ژیانی دونیا سێبەرو تاوە

شیعری حاجییە ژیان ئەوهایە
ئەوەلەن خواردن دووەم سوکنایە

سەتری عەورەتیش خودا دانیایە
ئەوجا ناسینی زکری خودایە

بەسیە وازبێنە خواچاکی داوە
لەلای خۆت ژیری بیرت تەواوە

پاشی کۆچ کردن دوگەزو جاوە
خۆت نەجات بدە لەم بەندو داوە

لەمە بەولاوە نیگات لەخودابێ
نوێژەکان بکە ڕوت لەمەولابێ

لەحیفزو ئەمانەتی خودابی
نازناوت برژاو کردەوەت وابی

لەیەزدان (جەمال) دەپارێتەوە
ئالای کوردستان بلاوبێتەوە

شەڕی کوردەکان بکوژێتەوە
نیشتمانی کورد بحەسێتەوە

خزمەت گوزار بوو بێ شەرم نەبوو
دەرحەق بێ دینان دڵ نەرم نەبوو
رەحیم و مشفق دڵ میهرەبان بوو
لە خەوفی خودا دائیم گریان بوو
ئومێدەواربوو بە لوتفی خودا
جەمیل والشیم و کەریم الوەفا
منەتی نەدەکرد لەسەر شانی کەس
ئیشی ئەو محضا بۆ خودا بوو بەس
حەکیم و دانا سەخاوەت پیشە
قائم بە ئەمری حەق بوو هەمیشە
طالبی رەضای حەق بوو ئەوەندە
وافی بە عهدو عەفووکوننەدە
ئەسیری دیبا دڵی پێ دەسوت
موصیبەتی خۆی بەکەس نەدەگوت
دائیم بە ڕۆژو شەو احیا گەر بوو
عالەم دەیزانی خیر البشر بوو
راغبی خیرات بزرگ هممەت بوو
دائم ئامادەی رێ ی قیامەت بوو
طەبیبي تەوان دۆستی فەقیران
نەرم وحەلیم بوو لە گەڵ ئەسیران
ئەوەی گەورە با زۆر گەورەی دەکرد
ئەوەی گچکە با رەحمی پێ دەکرد
زۆر بە ئەدەب بوو گەلێك عاقڵ بوو
هەم لە تەقسیمات گەلێ عادل بوو
لەشەر و خەزا گەلێ شەجیع بوو
صاحب مەرتەبەو قەدری رەفیع بوو

زۆر بـه وقـار بـوو صـاحب عـەظـەمـەت

کـەم قـصـەو گوفتـار گـەڵێ بەهیبـەت

دڵ بــەزکر بــوو شــیرین زوبــان بــوو

لێــو بــە تەبەسّـم دائـم خەنـدان بـوو

عـەفیف الـنفس دەسـت و داوێـن پـاك

لـەتیف الطبـع چـارە جـۆی غـەمناك

لـە ڕێیـان سـلاوی لـە خـەڵکی دەکـرد

ئەسـلا حەسـودی بـە کـەس نـەدەبرد

لـە عـەیبی مـەخلوق چـاوی دەپۆشـی

جارجـارە وابــوو مــەڕی دەدۆشـــی

بە دەسـتی کەوشـی خـۆی پینـە دەکـرد

دەچوە سـەر قەبران گـەر یـەکێ دەمـرد

بــۆلای نەخۆشـــان دەچــوە عیــادەت

بــەدەنی ســوك بوولــە بــۆ عیبــادەت

مەدحی حـەضـرەتـی قـەت تـەواو نابێـت

مەصـلـەحەت وایــە ئـەوجا کۆتـا بـێ

نـــــەوەکو بلـــێن قـــــسەی درێـــژە

چـونکە گـشت عالـەم لـەم فکـرە گێـژە

## بەشی دووەم

## باسی ولادەتی سەیدی سەرومر خیر البشر محمدی نازدار

ئەی موسڵمانینە رەحمەتتان لێ بێت گوێ بگرنە باسی ولادەتی گوڵی گوڵستانی نبوّەت سەروی بوستانی فتوّەت سوڵتانی تەختی جەلالەت ئافتابی فەلەکی ریسالەت سەر دەفتەری ئەنبیا تاجی سەری ئەولیا حەزرەتی (محمد المصطفی ) بەدڵ وزوبان تەوبەو إستیغفار بکەن صەڵەوات لە پێغەمبەر بدەن مونتەزری رەحمەت و بەرەکەت بن لە خزمەت جەنابی باری ئەو وەختە بۆ صالّحان رەحمەت دەبارێ ئەی موسڵمانان گوێ گرن ئەمە بەیانی وجودی زی جودی مەسعودی حەزرەتی رسول الله یە خۆشەویستی خودایە ،دونیا لە شەرافەتی ئەوی دانرایە گەورەیی ئەحمەد ئەگەر بکەین بەیان قەت تەواو نابێ بە نوسین و کەلام خۆشەویست بوو لای خوداوەندی جەلیل هەوڵی بۆ دونیا نەبوو تەها الامین شەوبەتاعەت رای دەبوارد تاکوو سەحەر هەر دەپارایەوە لە دەرگانەی خودای سەروەر بۆ ئەوەی خودای پەروەردگار ئەزیەتی ئۆمّەت و شوێن کەوتوانی نەدات هەرکەسێ دەیەوێ ببینێ رێ ی نەجات لێ بدا بۆ روحی پێغەمبەر صەڵەوات روون کردنەوەی خێرو پاداشتی خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر لەچەند خاڵێك دا

باسی گەورەیی وپاداشتی مەولودی پێغەمبەر ئەی موسڵمانان خێری مەولود کردن زۆر گەورەیە بۆ نەجات دانت لەترسی دونیاو رۆژی جەزا هەروەها بردنی ئیمان لەکاتی مەرگ دا بە إقراری ئەصحابەو ئەولیا

١- یاری غار ئەفزەڵی هەرچار یار خەلیفەی ئەوّەل ئەعلەم وئەکمەل رەفیقی شەفیق (ابو بکر الصدّیق) فەرمویەتی هەرکەسێ خەرج بکات دەرهەمێك بۆ مەولوودی ئەفزەڵی مەخلوقات بە تەحقیق رەفیقی منە لەسەر کانی و کانیاوی سەلسەبیل و رەحیق

٢- ئیمامی هومام قدوەی ئیسلام فاروقی ئەعزەم خەلیفەی دووەم زینەتی منبەر و میحراب ئەعدەلی ئەصحاب (عمر إبن الخطّاب) فەرموویەتی ئەو کەسێکی بکا تەعضیمی مەولودی حەزرەتی رەسولی رەب الارباب كأنّما زیندووی کردۆتەوە دینی ئیسلام و حەدیس و کتاب

٣- ئیمامی زەمان مەنبەعی حەیاو عیرفان خەلیفەی سێ هەم ذي النورين ( عثمان إبن عفّان) فەرموویەتی هەرکەسێ سەرف بکا دەرهەمێك لە خوێندنی مەولوودی پێغەمبەر صلّی الله علیه وسلّم کأنّه شەهیدی غەزای بەدرو حونەینە بە إیمان وبە إقان .

٤- اسد الله الغالب مظهر العجائب والغرائب خەلیفەی چوارەم (علي إبن أبي طالب) فەرموویەتی هەرکەسێك ببێتە باعسی خوێندنی مەولوودی حەزرەتی رەسولُ الله مەلکی وەهّاب زەفەر بە إیمان دەبا وەبەهەشت بۆی دەبێ طالب و راغب

٥- شێخ معروف کەرخی کەمەعدەنی تأسیرو إدراك و ئەدەبە مەرقەدی تریاکی موجەرّەبە فەرموویەتی هەرکەسێك دروست بکات چێشت ونان بانگ بکات موسڵمانان چرا هەڵ بکات لیباسی چاك لەبەر بکا موزەیّەن بێتو موجەممەل بێ موعەتّەر بۆ تەعزیمی مەولوودی سەیّدی سەروەر بە ئیمانی سەلیم لە دونیا دەچێتە دەر مەحفوز دەبێ بەتحقیق لەشەری شەیتانی بەدفەر لە مەحشەرێ هیچ کۆسپەیەکی نایەتە بەر لەسەر پردی صیراتێ نابینی خۆف و خەتەر دەچێتە ناو بەهەشتێ بەبێ میحنەت وغەم ودەردی سەر بە چاوی خۆی دەبینێ جەمالی خودای ئەکبەر

٦- رەئیسی عولەمای عیراقی وحیجازی ئیمام فەخری رازی خودا لێ ی ببێت رازی فەرموویەتی ئەگەر بخوێندرێ مەولوودی چاترین ئەفزەڵی مەخلوقات لەسەر چشتێك لە مأکولات تێیدا زاهیر دەبێت بەرەکات لەزگی إنساندا دەست دەکاتە إزتراب و حەرەکات تابۆ ئەو کەسەی خواردوویەتی مەغفیرەت دێ بەخەڵات مەولوودی شاهی لەولاك ئەگەر بخوێندرێ لەسەر ئاوی پاك هەر کەسێ بیخواتەوە دەبێتە پیاوی چاك دەچێتە نێو دڵی هەزار نورو رەحمەت دەردەچێت لەناو دڵی هەزار غەلّ وغەشّ و عیلّەت

مەولوودی حەزرەتی صاحیبی میعراج ئەگەر بخوێندرێ لەسەر سکّە لێ دراوی رەواج دەیکەوێتێ بەرەکەت صاحیبی قەت نابێ موحتاج سولّتانی عارفین حەزرەتی جلال الدين فەرموویەتی بەیەقین لەهەر مەکانێکی بخوێندرێ مەولوودی حەزرەتی سەیّدی مورسەلین دەورەی دەدەن مەلائیکەتی نورین تەبەق تەبەق

رەحمەتان بەسەر ئەھلی ئەو مەکانەدا دەرژێنن لە خەزێنەی رحمەتی رەب العالەمین ئەمما مەلائیکەی موقەڕەبین یەعنی جبرائیل ومیکائیل وإسرافیل وعزرائیل وقوربائیل وعینائیل وصافین وحافین و کرّوبین تەڵەبی مەغفیرەت دەکەن بۆ ئەو کەسەی بۆتە سەبەبی باعیثي خوێندنی مەولوودی حەزرەتی شەفیع والمذنبین لەسەری دەفع دەبێ قاتی و بەلاّ و طاعون و وەبا وسوتان وخنکان شەری رێگران ودزان وبوغزو حەسودی و چاو پیسی و جەمیعی ئافات ئیمان لە چەنگی شەیتانی بێ ئیمان خەلاص دەکات جوابی مەلائیکەتی قەبری کە نەکیرو مونکەریان پێ دەڵێن بەئاسانی دەدات .قەبری تەنگ و تاریکی بۆ دەبێتە باغ و باغات .

## بەشی سێ یەم

## باسی سوودی مەولوودی حەزرەتی محمد ﷺ

## بۆ نەجات لە جەمیعی ئافاتی دونیاو قیامەت

١- (( حیکایەت کراوە)) کەلەزەمانی امیر (هارون الرشید ) لەشاری بەسرا جەوانێك هەبوو پیسوو پەلید لە فاسقی داشاگردی ئەوی بوو یەزید هیچ چاکەی نەبوو لەپاش ئیمان فقط کەمانگی مەولوودیٚ دەهات غوسلی تەوبەی دەکرد تەعاماتی لیٚ دەنا دەیخوێندەوە مەولوودی حەزرەتی پێغەمبەری ئینس و جان وەختیٚ کە مرد لەبەر خراپییان فرێیان دایە سەر گوفەکان نەیان بردە سەر قەبران بانگێك هات لە ئاسمان ئەی ئەهلی بەسرا حازر ببنە سەر جەنازەی فلان جەوان کەوەلیەکە لە ئەولیائی خواوەندی رحمان ئەهلی شار جەوان و پیر وپاشا و دەروێش و گەداو فەقیر حازری سەر جەنازە بوون دەفنیان کرد بیٚ تأخیر لە خەویان دیت ئەوّەل شەو لە سەر تەختی بەهەشتیٚ دانیشتیە رووی وەك مانگ دەدا پرتەو پێیان وت ئەتۆ لە دونیادا زۆر فاسق بووی و ئەحمەق بەچی سەبەب شاد بووی بەحۆر وقسورو لیباس و سوندس و ئیستەبرەق ووتی بەسەبەب تەعزیمی مەولوودی ئەو حەزرەتەی کەبەئیشارەتی ئەنگوستی مانگی دەکرد شەق هەرکەسیٚ دەیەویٚ ببینیٚ ریٚ ی نەجات با لیٚ بدا بۆ روحی پێغەمبەر صلوات

اللّهمّ صلّي على سيّدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلّم

٢- (( حیکایەت کراوە)) کەحاکمێك هەبوو زۆر زالم و غەدّار بوو هەموو ساڵێك دەیکرد مەولوودی پێغەمبەری نازدار ئامۆزایەکی هەبوو بەتەماعی حکومەت بوو هەرچەند دەیکرد پیٚ ی نەدەبرد زەفەر دەمێك دیتی حاکمەکە لە خلوەت دانیشتووە بیٚ سیلاح وخادم و هەمسەر لەناکاو دەست بە خەنجەر هجومی کردە سەر گووتی ئەی خەبیثی پیسی بەدفەر کیٚ هەیە خەلاّصت بکات ئەلئان دەتکوژم سەرت دەبرم بەخەنجەر حاکمەکە بەسەر زوبانی داهات خەلاّصم دەکات مەولوودی پێغەمبەر هێشتا بەتەواوی قسەکەی لەزاری نەهاتبوە دەریٚ خشتێك لەدیواری دەرپەڕی بەسەر دڵی کەوت جیٚ بەجیٚ حەیاتی لیٚ بڕی نیدا هات لەئاسمان نەجاتمان دای بۆخاتری حورمەتی مەولوودی سیّدی صاحب ئەمان.

٣- ((حیکایەت کراوە)) لەئەیّامی عبدالملك إبن مروان جەوانێك هەبوو دائیما ئەسپی غار دەدا ڕۆژێك ئەسپەکەی سەرکەش بوو بۆی نەگەڕاوە ریّ ی کەوتەبەر دەرگای خەلیفە کوری خەلیفە لەویّ وازی دەکرد لەقەیەکی هاویشت ئەسپی بەدفەر سەرو سینەو زگی و پشتی تێك شکاند وەك فەنەر کەگەیشتە خەلیفە ئەم خەبەرەی وەحشەت ئەسەر دەریای غەزەبی هاتە جۆش دەستی کرد بەجۆش و خرۆش ئەمری کرد قاتلی جگەر گۆشەم بۆ بینن لەپێش چاوم بەئاگر بیسوتێنن جەللادو فەراش دەرپەڕین وەك شێری نەڕ دەنەرین دیتیانەوە جەوانەکەی مسکین لەدڵدا گوتی ئەی رب العالمین ئەگەر لەم بەلآیە خەلآصم بکەی شەرت بێت بکەم مەولوودی سەیّد المرسەلین کەهێنایانە حزوری خەلیفەکە چاوی پیّ کەوت دەستی کرد بەپیّ کەنین لەپاش ئەوەی نزیك بوو بخنکیّ لەبەر بوغزو قین فەرمووی ئەی جەوان ئەتۆ ساحری، گووتی لا والله یا امیر المؤمنین فەرمووی عەفوم کردی ئەمّا پێم بلّیّ کەتۆیان هێنا چ قسەیەکت بەسەر زوباندا هات ؟ گوتی لەو دەمەیدا گوتم یارحمن وە یارەحیم ئەگەر خەلآص ببم لەم واقیعەی عەزیم بکەم مەولوودی حەزرەتی پێغەمبەری کەریم ئەوجا خەلیفە پێی دا هەزار زێری سوور تاخەرج بکا لە مەولوودی پێغەمبەری پر نور ئەمەش بەشەرافەتی مەولوودی سەیّدی مأمور .

٤- (( حیکایەت کراوە)) لە مەملەکەتی بەسرە پیاوێك هەبوو هەموو ساڵ لەمەولوودی رەسولی مەلیکی متعال خەرجی دەکرد زێرو زیوو ماڵ جیرانێکی هەبوو جولەکەی دین بەتاڵ ژنەکەی لێی پرسی حیکمەت چیە هەموو ساڵێك لەم وەقتەدا ئەم جیرانە موسڵمانە ماڵی خۆی دەکا تالآن ؟ بەهیچ وپوچ و خۆرایی صەرف دەکا ماڵ و دراوی گوتی ئەو موسڵمانە وا زەعم دەبا کە پێغەمبەری وی لەم وەقتەدا هاتۆتە سەر دونیا کەشەوی مەولود هات ژنە جولەکەکە لەخەوی دیت یەك جەماعەت لەناوەراستیان دەڕوا زاتێك بەوقار بیّ سێبەر وپر ئەنوار شۆخ وشەنگ و مەه روخسار شەکر خەندەی شیرین گوفتار قەد عەرعەرو موو عەنبەر بۆن سونبل فریشتە سروشت جەمال بەهەشت فەصیح زوبان مەلیح دەهان خۆش بەیان نوکتەدان چاو ڕەشی ئەبرۆ کەوان ددان جەوهەر لێو مەرجان وەك مانگی لەناو چاردەشەو لە ناو ئەستێران دەرۆیی بۆ ماڵی جیرانەکەی موسڵمان ژنە پرسی

لەیەکێك لەوان کێ یە ئەم شۆڕە سەری بوستانی جان ؟ گوتیان ئەمە خاتەمی روسولە هادی سوبولە مەحرەمی ئەسراری خودایە ناسیخی دینی عیسی و موسایە ناوی موبارەکی (محمد المصطفى یە) صلّوا علیه وسلّموا تسلیما حتى تنالوا جنّة ونعیما.

ژنە گووتی بانگی بکەم جەوابم دەدا گوتیان تەکەبورو عنوانی نیە ئەبەدا بانگی کرد یا(محمّد المصطفى) فەرمووی لەبّەیکی یەعنی لەخزمەتت راوەستاوم گوتی ئەی نووری هەردوو چاوم کۆڵەگەی دینم کزەی جەرگم روح و هەناوم ئەتۆ چلۆن بەلەبّەیکی جەوابم دەدەی خۆمن دین دوژمنی تۆم فەرمووی قەسەم بەو زاتەی منی گێراوە بە پێغەمبەر وەهام جەواب نەدایەوە تانەم زانیوە هاتویەسەر دینی خۆم ژنەکە گوتی بلّێم چی؟

فەرمووی بلّێ (أشهد أن لا اله إلا الله وأشهد أنَّ محمّداً رسول الله ) هەر لەم خەوە نەزری کرد لەبەر ئەوەی خودا هیدایەتی دا هەموو مالّی خۆی بکاتە خێرو خێرات کە بەیانی بەخەبەر هات دیتی مێردی دروست دەکات چێشت ونان تەعام و زیافات پرسی ئەوە چیە گوتی ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە تۆ موسلّمان بووی لەسەر دەستی ئەوی هاتە خەونی تۆ هاتەهی منیش .....

هەرکەسێ بۆ شەربەتی وەصلّی محمّد تێنووە ،عاشقی نوری جەمالی ئەوبووە لێ بدا بۆ محمّد صلوات تاکو رزگار بێ لە رۆژی عەرەصات

٥-((حیکایەت کراوە)) لە شاری هەولێر پادشایەك هەبوو ناوی (سولّتان موزەفّەرەدّین ) بوو یازدە مانگ لە تەدارەکی مەولودی پێغەمبەر دا بوو لە هەموو ئەنواعی رەشە وولاّغ بیست و یەك هەزار قوربانی دەکرد چەند هەزار نەوعە تەعامی دروست دەکرد لە تەرەف وولاّتی (بوخارا) دوو هەزار عولەمای دەهێنا بۆ قەرائەتی مەولود خەلاّتی دەکردن شەوێك لە خەو دا چاوی کەوت بە حەزرەتی رەسول الله ووتی ﴿یا مظفّر یا نور العین أنقذني من شر هذین الأشقرین﴾. لە خەودا راپەری صەلّەواتی دا لە پێغەمبەر لە پاشان دیسان نووستەوە تیکرار پێغەمبەری لە خەودا دیتەوە ئەو کەلیمەی لە دەمی موبارەکی بیستەوە دووەم جار کە بەخەبەر هات دای لە جەمالی پێغەمبەر صەلّەوات دەفعەی سێ یەم نوستەوە دیسان هەمان خەونی دیتەوە وەزیرێکی عاقلّی هەبوو تەلّەبی کردوو خەونی بۆ گێرایەوە وەزیر گووتی رامەوەستە ئیشێکی گەورە لە مەدینەی

مونەوّەرە  قەوماوە. هەرئەو شەوە بەیەلغار لەگەڵ شەست بار زێر وزیـوو  درهـەم ودینار بەرێکەوت و ڕۆیی بۆ مەدینەی پـر ئـەنوار لـە مـسجدی رەسـوڵ الله دابـەزی لەبەر حیرەت دڵ و جـانی تـەزی ئـەمری کـرد ئـەی ئـەهلی مەدینـە جەماعـەت بـە جەماعەت بێن تا هەموویان بکـەم خـەلات هەرچـی دەهـات دەینـۆریێ بـە قەسـتی مستێکی زێر دەنایە نێو دەستی تا گـەورەو گـچکەی خـەڵات کـرد ریّ ی بـۆ سـەر مەقصود نـەبرد لەپاشـان پرسـی کـێ مایـە خـەڵاتی بکـەم گوتیـان کـەس نەمایـە بەغەیری دوو زاتی موبـارەکی نـورانی عابـدی خـەڵوەت خانـەی رووحـانی خـادمی دەرگاهی رەبّانی فەرمووی بانگیان بکەن بێنە لام بە ئیعجازو بەئیکرام کەهاتن ئەو دوو شەخصەی ئەشقەر لیّ ی پرسین ئێوە چ کەسن لێـرە .گوتیـان ئێمـە خـادمی پێغەمبەرین لێرە بوونمان زۆر خێـرە عیبـادەت دەکـەین پـارە بـە فـەقیرو فوقـەرا دەدەین فەرمووی جێتان لە کوێیە گوتیان لە حوجرەی مزگەوتێیە ئەوجا سـوڵتان موزەفەر چوو بۆ حوجرەیان بیّ تأخیر دیتی ڕاخرایە یـەك پارچـە حەسـیر هـەڵیان گرت لە ژێر حەسیر یەك تەختە دار بوو تەختە لادرا لەغەمێك دیـار بـوو چـووە نـاو لەغەم حاکمی ئەربیل تێیدا بوو قوڵینگ و پێمەرەو بێڵ لێیان دان بە شەق و زللەو مەترەق ئیقراریان پێ کردن بە موتڵەق گوتیان ئێمـە کـافرین هـاتوین وجـودی ذی جودی رەسول الله بدزین بیبەینە مەملەکـەتی فـەرەنگی لـەویّ بیـسوتێنین بـە بـێ دەنگی نەمان زانی تۆ دەگەیتە سەر روحمـان وابەشـۆخ وشـەنگی سـوڵتان ئـەمری کرد لە بەرامبـەر رەوزەی موتەهـّەرە شـەقیان کـردن ئـەم دوو سـەگەی بـێ فـەرە .لەئەترافی نبي هاشمي عليه الصلات والسلام  دوانـزە گـەز پـان بیـستو چـوار گـەز قوڵ سەدّێکی دارژاند لە قورقوشمێ سوڵتان بەبەرەکـەتی مـەولود نائیـل بـوو بـەم شەرەفە   هەرکەسیّ بۆ وەصڵی نبوّەت تێنوە عاشقی نوری جەمالی ئەو بووە زۆر بەگەرمی لیّ بدا بۆ ئـەو صـڵوات تـاکو رزگـاری بـبیّ لـە ڕۆژی عەرەصـات ئیمـامی شافعی دەفەرمویّ هەرکەسیّ دروست بکا چێشت و نـان بـۆ مـەولوودی حـەزرەتی پێغەمبەری ئاخیری زەمـان خـالی بکـا لـە مـاڵ خـۆی جێگـەو مـەکان خربکاتـەوە جەماعـەتی برادەران هـیچ تەقـصیر نـەکا لـە خزمـەت و ئیحـسان ببێتـە باعیـسی مەولودو تیلاوەی قرآن لە ڕۆژی قیامەت دا حەشر دەکریّ لەگەڵ صدّیق و ئـەولیا و شەهیدان بەبیّ زەحمەت و مـشەقەت دەچـێتە نـاو بـاغی جـەنان شـاد دەبێـت بـە حۆرو قصورو ویلدان و غیلمان.

## بەشی شەشەم

### ئەصلی إیجادی فەخری ئەولادی ئادەم

ئەی برادەران بۆتان بەیان کەم ئەصڵی إیجادی فەخری ئەولادی ئادەم لە پێش کلِّ مخلوقات نوری حەزرەتی بە هەزار هەزار و شەش سەدو حەفتا هەزار ساڵ ایجاد کرا دوازدە پەردەی بۆ تەرتیب درا پەردەی ، قودرەت ،عەظَمَت، مینَّەت، رەحمەت ، سەعادەت، کەرامەت، مەنزیلەت، هیدایەت، نبوّەت، ریفعەت، هەیبەت، شەفاعەت.

دوانزە هەزارساڵ لەپەردەی قودرەت دا تەسبیحاتی ئەوەبوو (سبحان ربّی الاعلی).
یانزە هەزارساڵ لەپەردەی عەزەمەت دا تەسبیحاتی ئەمە بوو (سبحان عالم السر واخفی).
دەهەزار ساڵ لەپەردەی مینّەت دا تەسبیحاتی ئەوە بوو (سبحان الرّفیع الاعلی).
نۆهەزارساڵ لەپەردەی رەحمەت دا تەسبیحاتی ئەوە بوو (سبحان الحیّ القیّوم ).
هەشت هەزارساڵ لەپەردەی سەعادەت دا تەسبیحاتی ئەوە بوو (سبحان من هو لایسهو).
حەوت هەزارساڵ لەپەردەی کەرامەت دا تەسبیحاتی ئەوە بوو (سبحان من هو غنيّ لایفتقر).
شەش هەزارساڵ لەپەردەی مەنزیلەت دا تەسبیحاتی ئەوە بوو (سبحان العلیم الحکیم).
پێنج هەزارساڵ لەپەردەی هیدایەت داتەسبیحاتی ئەوەبوو(سبحان ربّك ربُّ العزة عمّا یصفون).
چوار هەزارساڵ لەپەردەی نبوّەت دا تەسبیحاتی ئەوە بوو (سبحان ذي العرش العظیم).
سێ هەزارساڵ لەپەردەی ریفعەت دا تەسبیحاتی ئەوە بوو(سبحان ذي الملك والملکوت) .
دووهەزار ساڵ لەپەردەی هەیبەت دا تەسبیحاتی ئەوە بوو (سبحان الله وبحمده).
هەزار ساڵ لەپەردەی شەفاعەت دا تەسبحاتی ئەوە بوو (سبحان الله العقیم).

لەپاشان خوداوەندی (عظیم الشّأن) (دە) بەحری خەلق کرد:– یەکەم بەحری (شەفاعەت)هەزار ساڵ نوری حەزرەت لەناو ئەو بەحرە دەیفەرموو رەبّی رەبّی.
دووەم بەحری (نەصیحەت)دووهەزار ساڵ لەوبەحرە دەیفەرموو(إلاهي،إلاهي).
سێ هەم بەحری (شکر) سێ هەزار ساڵ لەوێدا دەیفەرموو(سیّدي سیّدي).
چوارەم بەحری (صەبر) چوار هەزار ساڵ لەوێدا دەیفەرموو (یا أحد یا أحد).
پێنجەم بەحری (سەخاوەت) پێنج هەزار ساڵ لەوێدا دەیفەرموو(یا واحد یا واحد).

شەشـەم بـەحری (إنابـەت) شـەش هـەزار سـاڵ لەوێـدا دەیفـەرموو(یـا فـرد یـا فـرد).
حەوتـەم بـەحری (یـەقین)حـەوت هـەزار سـاڵ لەوێـدا دەیفـەرموو(یـا علـي یـا علـي).
هەشـتەم بـەحری (حلـم) هەشـت هـەزار سـاڵ لەوێـدا دەیفـەرموو(یـارؤوف یـارؤوف).
نۆهـەم بـەحری(قەناعـەت) نـۆ هـەزار سـاڵ لەوێـدا دەیفـەرموو(یـا صـبور یـا صـبور).
دەهـەم بـەحری (مەحەبّـەت)دە هـەزار سـاڵ لەوێـدا دەیفـەرموو(سـبّوح، قـدّوس).

لەگۆشەی بەحری دەهەم سەجّادەیەکی نـورین داخـرا حـەفت هـەزار هەنـدی ئاسمان وزەمین لەم سەجّادە حەفت صەد مـەقام تـەرتیب درا یەکـەمیان مـەقامی تەوحید ئاخریان مەقامی مەحەبّەت. نوری حـەزرەت لەهـەر مـەقامێك هـەزار سـاڵ مەشغول بوو بەتەسبیحاتی حـەزرەتی جـەلالی صـەمەدیّەت لەپاشـان خوداوەنـدی عەظیم الشّأن فەرمووی ئەی نوری حبیب من کێم نورەکە گووتی ئەتو خالقی منی رازیقی منی خودای منی خودا فەرمووی ئافەرین ئەی نووری خـاص چـاکت ناسـیم عیبادەتم بکە بە إخلاص.
ئەوّەل دەفعـە حەڤـدە هـەزار سـاڵ لـە خزمـەتی مـەلیکی موتّـەعال ڕاوەسـتا خودای تەعالی قەبضەیەك نـوری زاتـی بەسـەردا ڕژانـد بەخـەڵات. لـەموقابیل ئـەم شەفاعەتە سەجدەی شوکری برد بـۆ خـودا. خـودا نوێـژی (صـبح)ی لەسـەروی و لەسەر ئوممەتی وی کرد بەفەرز پێنج دەفعە بەم دەسـتورە عەمـەل کـرا بعـد زان ئەمری پیێ کرد کە دوو رکعەت نوێژ بکات دوو رکعەت نوێژی کـرد بەشـازدە هـەزار ساڵ فەرمووی مەلیکی موتّەعال ئەی نوری حەبیبی خۆم قبولّم کرد ئەم نـەمازە چ مەقصودتە لێم بخوازە گوتی خودایە رجام وایە خێری ئەم نوێژە بە ئومّەتم کەرەم بکەی (خودای تەعالی) فەرمووی ئافەرین (ئـەی شـەفیع والمذنـبین ) قـەبولّم کـرد کەلامت بەجێم هێنـا مـەرامت الحـق رجـات بـەجیێ بـوو مـن ئـەوەم دەویـست لـەتۆ کەحەزرەتی رەسولی موختار ئەم نەوازشتەی دیت بەیەکجار صەد وبیـست وچـوار هەزار قەترەی نوری بەژمار چـك چـك لـیێ ی هاتـە خـوار هـەر یـەك بـو بەئەصـڵی پێغەمبەرێکی نازدار هەرکەسیێ دەیەویێ ببینیێ ریێ ی نەجات با لـیێ بـدا بـۆ روحـی پێغەمبەر صلّوات.

بعد زان نوری حەزرەتی کردە دەحیصّە لەحیصّەی یەکەم عەرشی ایجاد کرد عەرش تەختی خودایە چوار صەد هەزار روکنی لەبۆ قەرار درایە مابەینی کولّی روکنان چوار صەد هەزار ساڵ ڕێگایە ئەو عەرشی عەظیم لەسەر شانی هەشت مەلائیکەتان دانرایە.

لەحیصّەی دووەم ایجادی کرد قەڵەم پێنج سەد ساڵ ڕێ درێژو چل ساڵ ڕێ پانە مأمور بەئەمری رەحمانە خودای تەعالی فەرمووی بنوسە ئەی قەڵەم گوتی چی بنوسم ئەی رەبُّ العالەمین فەرمووی بنوسە بەنوسینێکی سەلیم کە قەڵەم گەیشتە لەفزی (الله) لەهەیبەتان شەق بوو هەردوو سەری لەیەك بوو جودا بەئیسمی رەحمان الرّحیم چاك بووە وەك قەڵەم وەستا بەهەزار ساڵ تەواوی کرد ئەم چوار کەلیمە چاکە ئەوجا خوداوەندی عظیم سوێندی خوارد هەرکەسێ لەئومّەتی محمّەدی سەلیم جارێك بڵێ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) ثەوابی هەزار ساڵ عیبادەتی دەدەمێ و شادی دەکەم بەجەنّات و النّعیم.

## بەشی حەفتەم
## باسی ئوممەتی پێغەمبەر
## کەلای خوداوەندی جەلیل چۆن باس کراون

بعد زان عـەدەدی قـەترەی بـاران گـەلآی داران رەملـی روبـاران دانەوێلـە و سـەبزەوات رۆژو دەقیقـەو سـاعات چـی لـەدونیا روبـدات تـاکو رۆژی عەرەصـات هـەمووی نوسـی بـە ئیسپات. لـەبۆ ئومّـەتان دەینوسـی هەرکەسـێ ئیتاعـەم بکـا جێگەی جەننات و النّعیمە ئەوەی بێ ئەمریم بکـا جێگـەی نـاری جەحیمـە، قەلّـەم ئیرادەی کرد بۆ ئومّەتی پێغەمبەر بنوسی وەك ئەوانی تر لە دەفتەر خودای تعـالی فەرمووی ئەی قەلّەم راوەستە مەنوسە زیاد وکەم بۆ ئومّەتی محمّد بنوسە ئـەوەی بێ ئەمریم بکا ئۆمّەتێکی گوناهکارە خوداش غەفور و غـەفّارە قەلّـەم هـەزار سـالّ سوجدەی تەعظیمی برد بۆ حەزرەتی علیم .

بعد زان خوداوەندی جلیل دەی گوت ئەی قەلّەم بلّند بکـە سـەر ئـەوجا سـەلام بکە لە پێغەمبەر قەلّەم سەلآمی کرد گوتی السّلام علیك یانور الهدی خودا جەوابی سەلامی لەباتی دا لەو رۆژەوە سەلام کردن بو بەسونّەت جوابەکـەی بـوو بـە فـەرز لە حیصّەی سێ یەم لەوح تـەرتیب درا لـەوح دانـە دوررێکـی بـەیـضایـە ئـەطـراف یاقوتی حەمرایە سەری بەعەرشەوە نوسایە بنی لەسەر شانی ملائیك دانرایـە رۆژی سێ صەدو شەصت جار مەنظوری نەظَری خودایە لەم خەلقە بعزێکیان زندوو دەکا هەندێکان دەمرێنێ عزیزان زەلیل دەکا زەلیلان عەزیز دەکـا فـەقیران غـەنی دەکـا غەنیان فەقیر دەکا صاغان نـەخۆش دەکـا نەخۆشـان سـاغ دەکـا لەحیصـصەی چوارەم مانگی ایجادکرد لەحیصّەی پێنجەم رۆژی خەلق کردبەحرێکی سێ هەزار سالّ رێ قولّی لەهەوا موعەللەق راگرت مانگ ورۆژ وەکو ماسـی لـەناو بەحرەکـە دا جاری کرد ئەگەر ئەو بەحرە نەبوایە نیقـابی روخساری ئابداری مـانگ سەرانـسەر عاشقی دەبوون وەکو بووت سەجدەیان بۆ دەبرد ئەگەر نەبوایە حجابی رۆژ لەبـەر گەرمی دونیاو مافیها دەسوتان هەموو رۆژێك ئەو نورە بەنورێکی تر دەگۆرێتـەوە ئەو حەرارەتە داوێتـە سـەر جەهەننـەم حـەرارەتێکی دی لەبـەر دەکـرێ کـە رۆژی قیامەت هات هەموو حەرارەتەکانی پێ دەدرێتەوە هەموو نوری لـێ دەسـندرێتەوە بە عەرشی عەظیم کەرەم دەکرێتەوە .

لەحیصّەی شەشەم بەهەشتی خەلق کرد کەمەکانێکە هیچ چاوێك جێگای واخۆشی نەدیوە هیچ گوێیەك مەکانی وای نەبیستووە مەکانێکی زۆر دڵ گوشایە ڕێگەی چونە ناو بەهەشتێ إتّیباعی حەزرەتی رسول الله یە ، بەهەشت هەشت تەبەقەیە، ئەوّەل تەبەقە دار الجلالە مەجموعی لە مرواری سپی یە، دووهەم دار السّلامە لە یاقوتی زەردە، سێ هەم جەنّەت والمأوایە مەجموعی لە زوبەرجەدی سەوز خەلق کرایە، چوارەم جنة الخُلده لە یاقوتی سورە، پێنجەم جنة النعیمە لە زیو ایجاد کرایە، شەشەم جنة الفردوسە ئەویش لە مسکی ئەزفەرە، هەفتەم دار القرارە لە زێر خەلق کرایە، هەشتەم جنة العدنە لؤلؤی تەرە، ڕۆژی قیامەت کەبەهشتی چونە ناو بەهەشت، ڕۆژی یەك شەممە نەوبە دەعوەتی ئادەم صفي الله یە، ڕۆژی دووشەممە نەوبەدەعوەتی ابراهیم خلیل الله یە، ڕۆژی سێ شەممە نەوبەدەعوەتی موسی کلیم الله یە، ڕۆژی چوار شەممە نەوبەدەعوەتی عیسی روح الله یە، ڕۆژی پێنج شەممە نەوبە زیافەتی حەزرەتی رسول الله یە، ڕۆژی جمعە نەوبە زیافەتی خودای تەبارەك وەتەعالایە(جلَّ جلالە وعمَّ نوالە).

مەجموعی پێغەمبەران لەگەڵ ئوممەتیان دەچنە سەر زیافەتی خودای مەننان حازر دەبن لە حەضیرەی قودسی هەر کەسێ لە مەقامی خۆی بە میقداری خۆی قەرار دەگرێ لەتەرەفی جەنابی باری مەرحەبایان لێ دەکرێ خودا دەفەرمووێ (یاکروب فکّهوهم) میوەیان بۆ بێنن تا سەد ساڵ باز مەرحەبایان لێدەکا دەفەرمووێ (یاکروب طعّموهم) تەعامیان بۆ بێنن تا سەد ساڵ باز مەرحەبایان لێدەکا دەفەرموێ (یاکروب اسقوهم شرابا طهورا) لەپیاڵەی بەللوور نۆش کەن تاسەد ساڵ باز مەرحەبایان لێ دەکا دەفەرموێ ( یاکروب توّجوهم) تاجیان لەسەر دەکەن باز مەرحەبایان لێدەکا دەفەرموێ (یاکروب ختّموهم) ئەنگوستیلەیان لەدەستی دەکەن باز مەرحەبایان لێدەکا دەفەرموێ (یاکروب طیّبوهم) بۆن خۆشیان دەکەن بعد زان مەخلوق بەخلّوەت قسان دەکەن حيٌّ وقەیّوم دەفەرموێ:—

(یامحمّد) ئەتۆ سەیّدی ئەبراری وەزیری موختاری بزانە ئەم خلّوەتە چیە کەحەزرەت سوئالیان لێ دەکا دەڵێن یاسیّدنا تاڵبی دیدارین لەدونیا وەعدەی دایە

خودا. ئەوجا خودای تەعالی حەفتا هەزار حجاب لادەبا جـەمالی خـۆی وەك مـانگی شەوی چاردە نیشانی مەخلوقات دەدا.

لەحیصّەی حەوتەم مەلائیکەتی إیجاد کرد کەعەبدی خودان شەوو ڕۆژ لەتاعەت دان نەخواردنـەوەیان هەیـە و نـەخواردن نەلیباسـیان هەیـەو نەنوسـتن لەهـەموو مـەخلوقات زۆر تـرن جـسمی لـەتیفیان نـورانین نـەنێرن نـەمێن تـا ڕۆژی حەشـر دەمێنن.

لەحیصّەی هەشتەم کورسی خەلق کرد لۆلۆێکە حەفت هەندی ئاسمان و زەمین لـە مقابەلـەی وی وەك حەلقەیێکـە لەبەرامبـەری صـەحرایەکی بـەرین ئـەویش لـە موقابەلەی عەرش وەهایە بەقەڵـەمی قـودرەت ایـة الکورسـي لەسـەر نوسـرایە لـە ئـەتراف چـەپی دەهـەزار کورسـی نەصـب کرایـە لەسـەر هـەر کورسـیەك دەهـەزار مەلائیکە دانیشتون ئایەتە الکورسی دەخوێنن خێری بەئایەتە الکورسـی خوێنـانی ئومّەتی حـەزرەت دەگـەینن هەرکەسـێك لـە پـاش نوێـژان ئایـة الکورسـي بخـوێنێ بەرەوانی بەقەدەری گرانی کورسی خێر داوێژرێتە پێ تەرازووی میزانی

لەحیصّەی نۆیەم ئـاوی ایجـاد کـرد بەنـەزەری هەیبـەتی پـەروەردگار ئاوهاتـە جۆش دەستی کـرد بـە جـۆش و خـرۆش پـێ ی نەماصـەبرو قـەرار کـەف کـرد بـێ حساب وبێ ژمار ئەرزی لەوکەفە خەلق کرا بوخـار لـەوی بڵنـد بـوو ئاسمـان لـەوی تەرتیب درا لەمەوجی ئاوەکەی خەلق کرا کێو و چیا بەرق لەوێ بـوو پەیـدا بـەردو ئاسن لێك خشا ئاگر لەوی بوو ئاشکرا لەو ئاگرە بەیەك دەم ئیجادی کرد جەهەنّەم جەماعەتی ئەجنّان لەو بلێسە خەلق کران بەهەشت لەژور ئاسمان جەهەنّـەم لـەژێر ئەرزان بەتەرتیب قەرار دران .

## بەشی هەشتەم
## خەلقەتی نوری سیّد المرسلین

بەعدە زان بەفەرمانی رەبّی جەلیل جبرائیل و إسرافیل ومیکائیل مقداری مثقالێکی خاکی پاك لەم جێگەی کە هێشتا رەوزەی موتّەهەرەیە هێنایان چوست و چالاك بۆ لانکی نوری حەزرەتی شاهی لەولاك ئەمری فەرموو رەب العالەمین ئەی جوبرائیلی پاك و ئەمین بینە لەبەهەشتیّ کافور و مسك و زەعفەران و سونبول ومائی مەعین و سەلسەبیل و شەراب وتەسنیم دەرسەعات جبرائیلی سەلیم چووە جەنّات النّعیم هەمووی هێناو هاتەوە بەیەك دەقیقەونیم گوتی خودایە حەز دەکەم بزانم بۆچی یە ئەم ئەشیایە فەرمووی (لەکافور ئێسکی حەزرەتی (محمّد) خەلق دەکەم لەزەعفەران رەگی تەرتیب دەدەم لەمسك خوێنی لەتەسنیم بێنی لە سونبل موی تابداری لەسەلسەبیل گوفتاری لەمائی مەعین لێوو زاری قوتوێك لەوان دروست کرا نوری حەزرەتی لەناونرا سەد هەزار مەلائیکە بەدەفتەر لە ئەرزو ئاسمان لەبەحروبەر گێرایان نوری حەزرەتی پێغەمبەر جبرائیل وەکو جارچی دەی فەرموو ئەمەطینەتی رەسولی رەبوالعالەمینە ئەمە نوری شەفیعوالمذنبینە نوری سیّدوالمرسلینە نوری پاکی خاتموالنبیّینە بعد زان ئەم قوتووە نورانیە یان وەکو قەندیل ئاوێزان کرد بە ساقی عەرشی رەبوالجلیل مەشغول بوو بەتەحمید و تەمجید و تەسبیح و تەهلیل راوی دەلێ ئەم ئەرزە لەپێشدا جێگەی ئەجنّان بوو کەبێ ئەمری خودایان دەکرد مەلائیکەتیان هاتنە سەری عزازیل کەشەیتانە بە أسیرییان برد بۆ ئاسمان مەشغول بوو بە تاعەت و عیبادەت بە غایەیەك هیچ جێگە نەما سوجدەی لێ نەبا ئوستازی مەلائیکەتان خەلیفەی ئەرزو ئاسمان ئەوّەل خەزنەداری بەهەشتێ بۆی موعەیّەن کرا ئەگەر مەلائیکەکان مەقصودێکیان هەبایە لەبارەگای خودا ئەو بۆیانی دەکرد رەجا حەتتا دیتیان لە لەوحدا کە عەنقەریب یەك لە موقەررییانی خودا مەلعون دەبێت و روسیاە دەستە بە دەستە دەهاتنە لای شەیتان بۆ دووعا دووعای بۆ وان دەکرد لەبەر مەغروری ناوی خۆی نەدەبرد دەفعەیەك دیتی لە دەرگای بەهەشت نوسرایە کە عەنقەریب یەکێ لە موقەرریبان دەکا بێ ئەمری خودا شەیتان گوتی ئیزنم بدە ئەی پەروەردگاری عالەم تا برۆم لەعنەتان لەو بەندەی بکەم خودا ئیزنی دا هەزار سالێ دەستی لەتەدریس و

تەقدیس هەلگرت علی الدوام لەعنەتی لەو بەندەیە دەکرد هەم هەزار سالّ
کەسەجدەی دەبرد لەئەرزو ئاسمان دەی دیت لەجیّ سەجدەی نوسرایە (لعنة الله
علی الشّیطان) ئەویش ئەو کەلیمەی دەگوت بەهەوەس نەیدەزانی لەخۆی لەعنەت
دەکا ئەو سەگی ناکەس چونکە کە ئیرادەی خوداوەندی هەشتا هەزار عالەم
موتەعەلیق بوو بە ئیجادی حەزرەتی ئادەم لەپاشان جەنابی ربُّ العالمین ئەمری
کردە جبرائیلی ئەمین هەستە برۆ روی زەمین بێنە چەنگێك خۆلّی رەنگین
کەجُبرائیل هات ئەرز دەستی کرد بەشین وگریان ونالّین و قورپێوان وهاوارو رۆ رۆ
بەجوبرائیلی گوت خۆم پاراست لەتۆ عیلاقەم مەکە هەستە برۆ فەقیرم زەلیلم و
دلّ بەغەم نیمە تاقەتی عەزابی ئاگری جەهەنّەم ئەوجا جوبرائیل زگی پیّ سوت
بەجیّ ی هێشت گەراوە بۆ بارەگاهی مەلەکوت ئەم واقیعەی گێراوە بۆ بارەگای
جەبەروت .ئیسرافیل و میکائیل یەك یەك وەکو جوبرائیل دەچوون دەهاتنەوە
بەتەعجیل خوداوەند ئەمری کردە عیزرائیل کە هادم اللّذات ئەتۆی موفەرّق
الجماعات ئەتۆی هیچ لەحظەمەسرەوە خاك لە زەمین هەلگرە زوو بێرەوە عزرائیل
هات بە چوستی لە ئەرزی قایم کرد دەستی ئەرز گوتی بۆچ واسەرمەستی
بەعەشقی خودا گەر رانەوەستی ئەرز گوتی هیچ چەنگانم لیّ مەدە عیلاقەم مەکە
بەرۆکم بەردە عیزرائیل فەرمووی پیرە ژنی چاو کوێری پشت چەوتی گویّ کەری
گێژو وێژی بیّ فەر ئەو قصانە چیە . نالّە نالّی پیرێژنان لەکن من إعتباری نیە
پادشاه و گەدا لەکن من مقداری نیە هاوار هاواری یەتیمان لەلای من إعتباری نیە
گەدا لەلای حوکمی پادشاه چ إعتیباری نیە بەندە لە موقابەلەی قەزای موبرەمی
الاهی چ إعتیزاری هەیە بەیەك چەنگ میقداری چل گەز خاکی هەلگرت لە مابەینی
(مکّەی مکرّمە) و(طائف) خوداوەندی عەزّە وەجەلّ فەرمووی یا عزرائیل ئەتۆ
بۆچی وەك ئەوانی دی رەحمەت بەحالّی ئەرز نەبرد (گوتی یا رەبّی ئەمری تۆم
لەلا گەورەترە لەرەحم بردن بەئەرزخودا فەرمووی (کەوابیّ ئەتۆم کردە قابضی
ئەرواحی ئەو طائیفەی کەلەم خاکەی دروستی دەکەم بەواجب وفەرز) عیزرائیل
گوتی یا رەبّی دەبمە مەبغوضی ئەنبیا و ئەولیا و صولەحا چونکە مردن زۆر
ناخۆشە دلّی هەموو کەسی لەبەر دەلەرزیّ پشت و چۆکی هەموو عالەم لەتاوی
دەتەزیّ فەرمووی عیلّەتان زۆر دەکەم کەنسبەتی نەدەنە بالّ تۆ بەلّکو حەملی

بکەنەسەر سوتان و کوژران وخنکان و تاعون و نەخۆشی و تاولەرز و دەردی گران.

بعد زان سی و نۆ ڕۆژو شەو بەسەر خاکەکەی دا باراندی بارانی غەم وماتەم و عوسرەت. شەوو ڕۆژێکی باراندی بارانی سرورو شادی و عوشرەت لێرە مانای ناخۆشی بەنسبەت خۆشی (١ بە ٣٩ ) یە خودای تەعالی بەدەستی قودرەتی خۆی صورەتی ئادەمی بەم هەیئەتە دروست کرد بێ روح مودّەی چل ساڵ لەوێ بەجێی هێشت پاشان خوداوەندی عظیمُ الشّأن ئەمری کردە روح بچۆرە بەر بەدەنی (ئادەم) روح کەتەماشای کرد حوجرەیەکی دیت تەنگ وتاریك گریا بەمەحزونی نالاًندی بەدەنگێکی باریك گوتی من بولبولی هەزار داستانی ئینسم قومری سەروی بوستانی قودسم طوطی شەکەرستانی مەلەکوتم نەغمە خوانی شاخساری لاهوتم ناچمە ناو ئەو قەفەسەی نۆ کون تێ ئەگەر بەئاگری غەزەبت هەموو پەروباڵم بسوتێ بەفەرمانی رەبّی جەلیل حەزرەتی جبرائیل جەوهەری نوری حەزرەتی پێغەمبەری لەپشت ئادەم دانا روح کە چاوی پێ کەوت پێ ی نەما صەبرو تەوانا بەشەوق و زەوق هاتە رەوت بەزۆر بەدەنی ئادەم کەوت ئادەمیان لەسەر تەخت دانا مەلائیکەتان هەڵیان گرت نایانە سەر شانیان گێرایان لەئەرزو ئاسمان رایان گرت لەبەرامبەر عەرشی رەحمان ئەمر صادر بوو ئەی مەلائیکەی فەرخوندە قەدەم سەجدە ببەن بۆ حەزرەتی ئادەم هەموو کەوتنەسجدە سەد ساڵ غەیراز شەیتانی بێ ئیمان و بەد فیعال جێ بەجێ رەنگی نورانی تەبدیل بوو رەش بوو وەك زوخاڵ فەرمووی مەلیکی موتّەعال ئەی لەعینی دین بەتاڵ بۆچی سەجدەت نەبرد بۆ ئادەمی بەکەمال . گوتی من لەئەو چاترم ئەصڵی وی لەقورە من لەئاگرم ئەوجا بەحەشمەت بەشەوکەت ئادەمیان بردە بەهەشت لەبەر نوری حەزرەتی ملائکەتان لەپشتی ئادەم دەست لەسەر دەست وەك خزمەتکار راوەستان صەفیان دەبەست ئادەم گوتی یا رەبّی ئەو نورە بێتە ناو چەوانم تا مەلائیکە راوەستن لەبەر دەستانم نورەکە هاتە ناو چەوانی صەف بەصەف ملائکە راوەستان لەبەر دەستانی

بعد زان ئادەم گوتی یاعزیز یا غفّار حەزدەکەم ئەو نورە لە جێگەیێك بگری قەرار کەبەدیداری شاد بێ ئەو بەندەی گرفتار دەست بە جێ نوری حەزرەت و

چاریار هاتنه پێنج أنگوستی بەئەژمار لەپاشان حەزرەتی ئادەم ڕۆژێك لەبەهەشت خەوتبو بێ خەبەر دایکه حەوّا لـه پەراسوی چـەپی خـەلق کرا کەبەخەبـەر هـات دیتی مەحبوبەیەك دانیشتووە لەتەنیشتی چەپی ئیرادەی کرد دەست لـەملانی بـێ نیدایەك هات ئەی ئادەم ئـەوەی نەکـەی لێت حەرامـه تامـارەی نـەدەی گـوتی یـا رەبّی چیه مارەی ئەم حۆری لقایه فەرمووی دەصلوات لەدیداری حـەزرەتی محمّد المصطفی یە.

ئەوجا خودای عظیم الـشّأن بـەئادەم وحـەوّای جـەوان بەغـەیری داری گـەنم لەهەموو تەعامی بەهەشتی ئیزن دان کەئەو حالەتەی دیت شەیتان هات بچێتە نـاو بەهەشت قبولّی نەکرد رضوان گوتی حەرامە بەهەشت لەتۆو لە مەجموعی کافران.

بعد زان لەگەڵ ماری بەست عەهدو پەیمان لەناو دەمی مار خۆی کرد پـەنهان بردیە ناو بەهەشت هیچ ئاگای لێ نەبوو رضوان خۆی هێنایە سەر شکلی صـالّحان ڕۆژێك لە ڕۆژان ئادەم و حەوّا لـەناو بەهەشـت دەگـەڕان دەیـان کـرد صـوحبەت و سەیران لەبن داری گەنم دیتیـان یـەکێ دانیـشتووە بـەزوبان دەکـا زکـری مـەلیکی مەنّان لەگەڵیان کەوتـە قـصان گـوتی ئێـوە بۆچـی لـەو دارەی نـاخۆن چ لوقمـان گوتیان نەهی کردووە خوداوەندی رەحمان گوتی ئێوە فـەقیرن و هـیچ نـەزان ئـەو دارە شجرة الخلده قەسەم بەزاتی ئەحەد ئـەمن ناصحێکی ئـەمینم و بـێ حەسـەد هەرکەسـێ لـەم دارە بخـوا لەبەهەشـتێ دەبـێ مـوخـەلـەد تأسـیری لـێ کـردن وەسوەسـەی شـەیتانی بـەد خواردیـان داری گـەنمی نورەکـان چـوونەوە پـشتی ئادەمی روت وقـوت کـران لەبەهەشـت فـڕێ دران چـونکه دایکـه حـەوّا زوتـر هـەڵ خەڵەتابوو بۆ خواردنی داری گەنمی ئەویش دابوی تەحریکی ئادەمی بۆیە تائیفەی ژنـان موبتەلانـە بەحـەیز و نفـاس و گرانـی وضـعی حـەمل و محنـەتی عیدّەو بـە نوقصانی میرات و شاهدی و دیـن و مـەحرومی لـە جمعـەو جـەماعات و بەنـەبوونی هیچ پێغەمبەران لەوان .

کـەئادەمیان لەبەهەشـت هاویـشتە خـوار (٣٠٠) سـێ سـەد سـاڵی بەئـەژمار لەشەرمان نەی نوّرییه ئاسمان چە تاقـە جـار کردیـە گریـان وشـین وهـاوار لەبـەر ئاوی چاوی ڕۆیی جۆگەو جۆبار تاپشتی لەقورێدا چـووە خـوار نـەیبوو خـواردن و خواردنەوە و صەبرو قەرار تەقدیر الله سەری بڵند کرد یەك جار دیـتی لـە پێـچکەی

عەرشی جەبّار نوسراوە ناوی محمّدی مختار لەگەلّ ناوی موبارەکی پەروەردگار
گووتی ( یا رحمن یا غەفّار بەعەشقی محمّدی نازدار خۆش ببە لە گوناهم رەحمیٚ
بکە بەشین و گریان و ئاهم) .

فەرمووی خوداوەندی قەیّوم بۆ خاتری محمّد لە گوناهت خۆش بووم ئەگەر
محمّدت کردبایە شەفیعی جەمیعی گوناهکاران مەغفیرەتم بەسەردا دەباراندن
وەکو باران.

بعد زان جبرائیلی خۆش مەنظەر بە قوّەتێکی تەمام ئادەمی لەناو قوڕی
فرمێسك هێنایە دەر لەکێوی (عرفە)ی ناسیەوە (حوّا)ی خۆش مەنظەر نوری
حەزرەت لەپشتی ئادەم چووە رەحمی حەوّا (شیث) لەوبو ظاهر عەهدی کرد
کەئەو نورە دانەنیٚ ئیلاّ لە محەلّێکی تاهیر ئەم نورە موبارەکە هاتە خواریٚ پشت
بە پشت لەپشتی:-

م

ئەو نورە كۆ دەبێتەوە دەچێتە ئاسمان دوایی دێتەوە خوارێ دەگەڕێتەوە پشتی من كەلەسەر ئەرزی دادەنیشم گوێم لێ یە ئەرز دەڵێ السّلام علیك یا حامل نوری حەزرەتی رسول الله كەلەبن داری ووشك دادەنیشم جێ بەجێ سەبز دەبێتەوە و سێبەرم  داوێتە سەر كەلەژێری دەڕۆم دارەكە ووشك دەبێتەوە ئەوجا لەوكاتەی عبدالله ی نەوجەوان عومری موبارەكی بووە بیست وپێنج ساڵ ئەوجا ژنی إنسان و ئەجنّان كچ و ژن و پیرو نەوجەوان سەبەب بەنوری سەیّدی إنس وجان بەدڵ وجان عاشق و والە و حەیرانی عبدالله ببون هەموو عەقڵیان گۆڕا بوو بۆی ببونە مجنون شەو و ڕۆژ ڕێگایان پێ دەگرت ئەمّا لوتفی خودا لەشەری وانی حفظ دەكرد .

## بەشی نۆیەم
## باسی نەقل بوونی نوری پاکی حەزرەت لە
## ( عبدالله )ی باوکی بۆ ئامینە خاتونی دایکی

لەپاشان عبدالمطلب ئامینە خاتونی بەغەمزەو ناز بۆ عبدالله ی کرد داخواز ئەو رۆژەی کە شایی بۆ دەگەڕا عبدالله ی نەوجەوان بەنیّەتی راویّ چووە صەحرا إتّفاقا یەك لە کچی پادشای شامیّ فاتیمە ناو لاوچاك تر بوو لە ماهی تەواو ئەو خاتوونە شیرینە بەخەزێنەو دەفێنە بە جەواهیرو خەدەم و حەشەم بنەو بارەگای هەڵدابوو لە صەحرای مەککەی موعەظەم لەناکاو چاوی بە جەمالی عبدالله کەوت کە وەك مامز دەکا رەوت لە دەهشەتان ناوکی کەوت لەناو خێوەتی دەرکەوت ئەو نیشانانەی لە کُتوبان دا دیتبوی لەوی چاو پیّ کەوت پیّ ی گوت کزەی جەرگم رووح وهەناوو دلّ و جانم بە قوربانت بێت قەدەم رەنجە بخە خلّوەت خانەی فەقیران بە جەمالی خۆت رووناك بکە حوجرەی تاریکی ئەسیران عبدالله لەگەڵی چووە ناو خیوەتی ژەنگاری داینا لەسەر تەخت مورەصّەع بە گەوهەر و مرواری دەستیان کرد بەشەکەر باری چونکە فاتیمە عاشقێك بوو بیّ تاو دامێنی عبدالله ی گرت بەهەشتاو گوتی بە قوربانت بیّ جەرگ و هەناو لە شەربەتی وەصلّی خۆت بم دەریّ قومێك شەکراو لە تۆڵەی دەتدەمیّ هەزار هۆقە ئاڵتونی تەواو ، عبدالله فەرمووی ئەی خاتوونی بەڵەك چاو منیش زۆر حەزدەکەم کەبە وەصلّی تۆ شادبم ئەمّا بەمەرگی تۆ ممکن نیە بەبیّ تەدبیرو پرسی بابم عبدالله رووی کردەوە ماڵیّ دەتگوت تاووسی مەستە دەستی ئامینە خاتونیان نا لەدەستا ئەو شەوە لەگەڵی نوست کەسبەینیّ لە خەو هەڵسا حکایەتی فاتیمەی شامی عەرزی بابی کرد باوکی گووتی رۆڵە زۆرم را لەم مامەڵەیە هیچ رامەوەستە عبدالله رووی کردەوە لای فاتیمەی مەهجور فاتیمە جەمالی عبدالله ی دیت دووربەدوور زانی لەلای نەماوە یەك زەرە نور گرگرِ بلّێسەی هەناسەی هاتە دەر وەکو تەندور گوتی ئەی عبدالله مە قصودی من کە هاتبومە چۆل و صەحرا ئەتۆ نەبووی والله و بالله مەتلّوبی من ئەوە بوو کەشاد ببم بەنوری حەزرەتی رەسول الله ئەو نورەشت ئەو شۆکە دانا انا لله بە چاوی پر ئاو بەجەرگی براو بە فرمێسکی ئەرخەوانی بەرەنگی زەعفەرانی لەگەڵ قافیلەی غەم و حەسرەت و ئەندێشە فاتیمە رووی لە شامیّ کردەوە لەبەر

تأسّوف وغەم وغوصّە وەفاتی کرد ئارەزووی نوری حەزرەتی رەسول الله ی بۆ ژێر
خاك برد بەلاّم بۆ سەفەری مردنیّ تەنها نەبوو بەلّکو ئەو صبحەینە دوو سەد ژنی
نازداری قورەیشیان بەم خەفەتەی چوون ئەو شەوەی کە نوری نبوّەت لە
رەحمی ئامینە خاتوون قەراری گرت شەوی جمعە بوو لەم شەوەخودا جەلّ و عەلا
ئیرادەی فەرموو خەلق بکا حەبیبی خۆی محمد المصطفی شەوی جمعە مانگی
رەجەب بوو خودای تەعالا ئەمری فەرموو خازن دەرگای بەهەشتیّ بکاتەوە
جارچی جاڕی دا بە ئاسماندا وەبە ئەرزاندا کەنوری محمّد المصطفی ئەمشەوە لە
رەحمی ئامینە خاتوونی قەراری گرت زاهیر دەبیّ بەشیرو نەزیر ئەمجا
مەلائیکەتان تەبەق تەبەق نوریان نثار کرد دەرگای جەهەنّەم کلیل درا بەهەشت
وەك بووکان موزەیّەن کرا حۆریان خۆیان ئارایش دا سەریان لە قەسرو قصوری
بەهەشت دەرهێنا گوڵی بەهەشتیّ پشکوتن نەسیمی بەهەشت ئەنگوتن غونچە
دەمی داوە دارەکانی ووشك ژیاوە طیور هاتنە خرۆش جۆگەو جۆبار هاتنە جۆش
حۆریان خۆیان بۆن خۆش کرد ولدان شەرابەن تەهوریان نۆش کرد بلبل مەست
بوون لەسەر چلاّن نەسیم وەربوون بەناو گولاّن گلّوك سوربوون گیا پڕنور بوون
گولاّن گەش بوون وەنەوشە رەش بوو نێرگز پشکوت لالە بزووت درەخت هاتە بەر
میوەی کەوتەدەر .

## بەشی دەیەم

## باسی ئاهەنگی شادی بەهاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ جیهان

حەزرەتی جوبرائیل بە فەرمانی ربِّ جەلیل لەگەڵ هەشتا هەزار مەلائکە هاتنە سەر ئەرز ئالآیەکی سەوزیان لەسەر بانی کەعبە چەقاند رەگی جەرگی کافرانیان پساند تەختی پادشاهان سەر بەرەو خوار کرا زۆریان تاقەتی قسەکردنیان لێ برِا إبلیسی پیسی خسیسی بەخیسی و خەبیسی پڕ تەلبیسی غەدّاری خوێن خواری مەکّاری سەحّاری تەرّاڕی ئیدباری بێعاری مەترودی جەهەنّەمی شەقی سەر شەق دووشەقی تەڕو تازەی تێ هەڵدرا کلکی لەناو گەڵی نابوو وەك سەگی هار لە بەحرو بەڕۆ لەدەشت و چۆل دەگەڕا نەیدەگرت قەرار بعد زان هاتە سەر کێوی ئەبوو قوبەیس هاوارێکی کرد سەگ بەچەکانی وەك سەگ مەگەس دەوریان دا راست و چەپ وپێش وپاش ئەحواڵیان پرسی بۆچ دەلەرزی بۆ دەترسی گوتی وەختە لە عاجزیان بپسێم لە حەیفان بدڕێم رەواجمان نەما پشتمان شکا نوری خاتەم الانبیا قەراری گرت لە رەحمی دایکی مەبعوس دەبێ بە نوری رەخشان بە شیری بوڕان دەشکێنی بت و ئەصنام شەڕاب و قومار دەکا حەڕام ئاتەشگەدان دەسوتێنێ معجزات دەنوێنێ سەر رەقان نەرم دەکا دڵ ساردان گەرم دەکا شەفاعەت بەتابعی دەکا کافران مەهجور دەکا رجمی شەیاتین دەکا هەتکی سەڵاتین دەکا مانگ بە ئەنگوست شەق دەکا جێ بەکافران لەق دەکا بەیداغی دین هەڵدەکا چار پەلی زاڵمان پەل دەکا دونیا رەوشەن دەکا زەمین گوڵشەن دەکا صاحیبی نورە باعثی سرورە تاجی کەرامەتی لەسەرە شافعی رۆژی مەحشەرە صاحبی موعجزە و کیتابە ئەمر دەکابە چاکە نەهی دەکا لە خراپە لەرێ ی خودا غەزا دەکا دینی بەحەق إحیا دەکا سیّد المُرسلینە ناوی موبارەکی (محمّد و أحمد و تەهاو یاسینە) گشت بلّندان دەکا نەوی هیچ پێغەمبەری دی نابێ لە پاش ئەوی ئومّەتی ئەون سەر دەفتەر چونکی دەکەن ئەمر بە مەعروف نەهی لە مونکەر

گوتیان ئەی پیرە گورگی ئێمە لەسەر شەش تەبەق غالب بووین لەسەر ئەم تەبەقەش غالب دەبین تامی گوناهانیان لەلا شیرین دەکەین وەکو هەنگوین ئێمەش ئەوان دەپسێنین بە خەفەتان دەیان درێنین بە حەسرەتان بە عیبادەت کردن و تاعەت بە بەندایەتی بۆ خودای تاقانە بە گوتنی ئەم قسانە هەموو

مەخلوقات رەحمەتتان لیّ بێت بلّێن یا رەبّی تەوبە أستغفر الله أُشهد أن لا إلە الا الله وأشهد أنَّ محمّداً رسولُ الله .

### بەشی یازدەم

### وەفاتی عبدالله ی نەوجەوان باوکی حەزرەتی محمد ﷺ

### پێغەمبەری ئاخیر زەمان

بعدزان عبدالله ی نەوجەوان بە تیجارەت بۆ شام چوو لە هاتنەوە دا لە مەدینەی منەوّەرە نەخۆش کەوت هەر لەویّ وەفاتی کرد هادم اللّذات مفرق الجماعات (یەعنی مەرگ و وەفات) بناغەی وجودی کرد وێران مەلائیکەی هەر حەوت ئاسمان دەستیان کرد بە واوەیلاو گریان بە شین وزاری و نالاّن گوتیان یارحیم ویارحمن و یاکریم و یامنّان) حەبیبی تۆ بە هەتیوی مایەوە کیّ هەیە بە خێوی بکا ئەو بەلّەك چاوە خودا فەرمووی مورەبّی و ظە هیری منم موعین و نەصیری منم رازقی منم لە دایك و باوکی مشفق تر منم . کەئەو خەبەرە گەیشتە خزمان دەستیان کرد بە شین و گریان بە جەزەع و فەزەع و قورپێوان خصوصا ئامینە خاتونی پەرێشان بیّ هۆش بوو تاسیّ رۆژان لە داخا زکی پربوو لە ژان وەك بی ناو ئاو قامەتی شۆخ و شەنگی هاتە هەژان دەگریا بەنالّە نالّ و هاوار و زاری فرمێسکی دەباراند وەك بارانی بەهاری لە فیراقی باوکی حەزرەتی محمّد المصطفی عبدالله یجوانە مەرگ صاحیبی شەرت ووەفا

## بەشی دوازدەم
## باسی چۆنیەتی لەدایك بوونی حەزرەتی
## محمّد المصطفی

حەزرەتی ئامینە دەفەرمووێ کە حامله بووم بەسەیّدی سەروەر، لە مانگی (ئەوّەل) مانگی رەجەب بوو لە خەودا دیتم پیاوێك هات بە شەوکەت وکەڵەگەت و رەنگ ئەسمەر فەرمووی مەرحباً بك یامحمّد.

ئامینە فەرمووی پێم گووت ئەتۆ کێ ی فەرمووی منم ئادەم ئەبو البشر باوکی هەموو بەشەر گوتم کارت چیە فەرمووی موژدە بێت حامله بووی بە سەیّدی بەشەر بە شەفیعی ڕۆژی مەحشەر بەفەخری قەبیلەی رەبیعەو مظر لە مانگی (دووەم) هات پیاوێك فەرمووی السّلام علیك یارسول الله ئامینە دەڵێ پێم گوت ئەتۆ کێ ی فەرمووی ئەمنم حەزرەتی شیث گوتم کارت چیە فەرمووی مزگێنی بێ حامله بووی بە صاحبی ئایات و معجزە وتأویل وحەدیث.

لە مانگی (سێیەم ) هات زاتێکی عالی صیفات دەیکرد تەحمیدو تەقدیس فەرمووی السّلام علیك یانبی الله ئامینە دەڵێ پێم گووت ئەتۆ کێ ی فەرمووی منم حەزرەتی ئیدریس گوتم إدّعات چیە فەرمووی بەشارەت بێ حامله بووی بە پێغەمبەرێکی رەئیس .

لە مانگی (چوارەم) هات شەخصێکی وەك رووح فەرمووی السّلام علیك یاحبیب الله ئامینە دەڵێ پێم گووت ئەتو کێ ی فەرمووی منم حەزرەتی نوح گوتم خزمەتت چیە فەرمووی کەیف خۆش بە کە حامیلەی بە صاحبی غەزاو نەصرەت و فەتح و فتوح.

لە مانگی(پێنجەم) زاتێك هات بێنی دەرۆیی وەك قورونفل وعود فەرمووی السّلام علیك یا صفوة الله ئامینە دەڵێ گوتم ئەتو کێ ی فەرمووی منم حەزرەتی هود گوتم مەتڵەبت چیە فەرمووی خۆشە بە حاڵت کە حامله بووی بە صاحبی مەقامی محمود ولواء ی معقود.

لە مانگی(شەشەم) هات زاتێك بە تەعظیم و تەبجیل فەرمووی السّلام علیك یا رحمة الله ئامینە دەڵێ پێم گووت ئەتو کێ ی فەرمووی منم حەزرەتی إبراهیم

خليل گوتم كارت چيه گوتی مژده بیٚ حامله بووی به پێغەمبەرێکی جليل به هەمنشينی جبرائيل .

له مانگی(حەوتەم) هات زاتێکی لاو چاك ومحبوب و مەليح فەرمووی السّلام عليك يا من أختارك الله ئامينه دەڵێ پێم گووت تۆ کیٚ ی فەرمووی منم حەزرەتی إسماعيل ذبيح گوتم فەرمانت چيه فەرمووی مژده بیٚ حامله بووی به پێغەمبەرێکی بەليغ و فەصيح.

له مانگی (هەشتەم) هات شەخصێکی عالي شأن فەرمووی السّلام عليك ياخيرة الله ئامينه دەڵێ پێم گووت ئەتو کیٚ ی فەرمووی منم حەزرەتی موسی إبن عمران گوتم كارت چيه فەرمووی بەشارەت بیٚ حامله بووی به پێغەمبەرێکی لەبۆی بەخەلاّت دێتەخوارێ قورئان.

له مانگی(نۆيەم) هات زاتێکی مبارك قەدەم فەرمووی السّلام عليك دەنی القرب مينك يارسول الله ئامينه دەڵێ پێم گووت تۆ کیٚ ی فەرمووی منم عيسی إبن مريم گوتم ئەمرت چيه فەرمووی چاوت ڕووناك بیٚ ئەی ئامينه خاتوون حامله بووی به پێغەمبەرێکی گوڵ خونچه دەم لەسەر تۆش دەفع بوو غەم و غوصّه و ئەلەم.

صدّیقان پاك ئامینە دەڵێ لە حوجرەی خۆم دانیشتبوم تەنها و عاجز و غەمناك گوتم هاوار لەبۆ خۆمی ماڵ وێران کەس نیە قومێکم ئاو بداتێ خنکام لە تێنان کەس نیە خزمەتم بکا وەکو مامان کەس نیە پاڵی پێ بدەم کەس نیە قصەیەکی لەگەڵ بکەم کەس نیە ئەنیسم بێ کەس نیە جەلیسم بێ کەس نیە پشتیوانم بێ کەس نیە غەم خوارم بێ ئامینە دەڵێ لە ناکاو دیتم چوار ژنی بالاّ بڵندی ئاهو رەفتار هاتنە لام یەکەمیان دەستی کرد بە گوفتار گوتی کێ هەیە مثلی تۆ ئەی ئامینەی پەری روخسار تۆی حاملە بووی بە محمّد المصطفی ی نازدار هات دانیشت لەلای راستم گوتم ئەتۆ کێ ی ئەی خۆش کەلام فەرمووی منم دایکە حەوّام دووهەمیان هات دانیشت لەلای چەپم گوتم ئەتۆ کێ ی ئەی روومەت قەندیل فەرمووی منم سارا خاتوون حەرەمی إبراهیم خلیل سێ هەمیان هات و دانیشت لەلای پشتم گوتم تۆ کێ ی ئەی خانم فەرمووی منم ئاسیەی کچی مەزاحم چوارەمیان هات ئەمّان دەتگوت رۆژە هەلاّت لە لێوانی دەباری شەکرو نوقڵ و نەبات لە پێشەوە دانیشت گوتی ئەی ئامینە خاتوون گرانایی خۆت باوێ سەرمن روحم ببێ بەفیدات گوتم ئەتۆ کێ ی ئەی رووحی رەوان ئەی شۆرە سەری بوستانی جان فەرمووی منم مەریەمەی کچی عمران هەرچوارمان مامانی تۆین و دایانی پێغەمبەری ئاخر زەمان ئامینە دەڵێ ئولفەتم گرت بەوان دەستمان کرد بەقسان دیتم مەخلوقات روویان کردە حوجرەی من جەماعەت بە جەماعەت ئەصواتی موتەشابهات لوغاتی موختەلیفات لەنێو حوجرەی من دەهات بڵێسەی نورین پەیدابوو لە هەموو وولاّت لە پێش و لە پاش و لەچەپ و لە راست لەناکاو دیتم هەورێکی سپی لەناو هەورەکە دەنگێکم بیست دەیفەرموو ئەی مەلائیکەی نورین حازر بکەن تەشتی زێرین لەگەڵ مەسینەی جەواهرین بینن لە بەهەشتێ مەندیلی سوندسی سەبز و رەنگین دابنێن لەناو ئەو تەشتە زێرەی حەبیبی پڕ کەمالی من بشۆن بە ئاوی ئەو مەسینە جەواهیر بەندە بەدەنوو روخساری محبوبی بێ مثالی من ئەوجا بەخاتەمی مۆری نبوّەت تصدیقی بکەن، بیدەنێ صفوەتی ئادەمی مەعرفەتی شیثی خەلقەتی إبراهیمی ئیستیسلامی إسماعیلی صبری أیّوبی حلمی یەعقوبی جەمالی یوسفی دەنگ خۆشی حەزرەتی داودی ئەمر و پادشاهی سلێمانی حکمەتی جەنابی لقمانی قوّەتی موسی ی عیبادەتی یەحیای زوهدی حەزرەتی عیسای علی نبیّنا وعلیهم أفضل الصّلاة والسّلام.

## بەشی سێزدەم

خودای گەورە ئـەمری کـرد بـە جوبرائیـل بـە ئامـادەکردن و رازانـەوەی ئـەرزو ئاسمان بە بۆنەی نزیك بوونی ولادەتی ئەشرەفی ئەولادی ئادەم پێغەمبەری ئـاخیر زەمان. بعد زان خودای عظیم الـشّأن ئـەمری کـردە تاووسـی مەلائیکـەتان یـەعنی جـوبڕائیلی ئـەمین و ئـەمان پربکـە پیالـّەی بـەلّوور لـە شـەڕابەن تـەهوور رابێخـە سەجّادەی قوڕب و وصال بۆ صاحبی نور و رەفعەت وإتّصال بەرضوانـی بلّـێ بـاغ وباغات و قەصر و قصوڕ و غلمان و حۆری بەهەشـتێ برازێننـەوە بـە مـالکی بلّـێ دەرگای جهەنّەم کلیل بدا ئالاّی محەبّەت دابنێ لەسەر شان بانگ رابێلّـە لـە ئـەرزو ئاسمان لە کێوان و لە دەشـتان لەبـەڕیان و لـە بـەحران کەنزیکـە عاشـق جـەمالی مەعشوقەی ببینێ موحب میوەی باغی وصـالی مەحبوبـەی بـچینێ دەسـت بـەجێ حەزرەتی جوبرائیل علیە السّلام بە جـێ ی هێنـا فـەرمانی ربُّ الجلیـل جـلَّ جلالـە عەرش و کورسی و سەما لەگەڵ دڕندەی دونیا دەستیان کرد بە هەڵپەڕین و سـەما ونەغمە و ئاواز و صەدا سێ ئالاّ هەڵکرا یەك لە مەشرق یەك لە مەغریب یەك لەسەر بانی کعبة الله هەر ئالاّیەکی صەد هـەزار مەلائیکـەتی راوەسـتا بـو لـە بنـدا ئامینـە دەڵێ زۆر تینوم بوو لەو وەختـەدا پیاڵەیـەکی پـڕ لەشـەربەتیان بـۆ مـن هێنـا کـە خواردمەوە نورێکی عظیم لە پێش چاوم بو پەیدا کە تەماشام کرد تـەیرێکی سـپی بوو کـە حـەزرەتی جوبڕائیـل بـوو هاتـە حوجرەکـەم بـە قـەدەمی صدق و صـەفا شاپەڕی موبارەکی بەسەر دڵم داهێنا بە ئاسانی وەضـعم کـرد و دامنـا حـەزرەتی محمّد المصطفی.

## بەشی چواردەم
## دوعای مەولودی شەریف

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين اللهم انا قد حصرنا مولود نبيك وصفوتك من خلقك علينا ببركته خلع العز والتكريم ومتعنا بالنضر الى وجهك الكريم واجرنا من عقابك الاليم بفضلك وجودك وكرمك يا ارحم الراحمين اللهم انا نسألك بجاه المصطفى اهل الصدق والوفا بصحبه الابرار والانوار كن لنا عونا ومعينا مسعفا وبوئنا من الجنه قصورا وغرفا اللهم انا نسألك بجاه النبي المختار واله الاخيار ان تجعلنا من خيرة امة رسول الله وامتنا على سونته واحشرنا في زمرته واملأ قلوبنا بنور معرفتك واحرس اقدام الكفار من المرور بمواطن السيئات وامنع طيور نفوسنا من الوقوع في شبكات الموبقات برحمتك يا ارحم الراحمين وان تكفر عنا الذنوب والاوزار ونجنا من جميع المخاوف والاخطار وتقبل منا ما قدمنا من يسير اعمالنا في السر والاجهار واغفرلنا ذنوبنا انك انت العزيز الغفار بلغ اللهم واوصل ثواب ماقرىء بتمامه وكماله من هذه القراءه الشريفه والمولود الشريف زياده في شرف نبينا محمد ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ ثم في شرف اله واصحابه و اهل بيته الطيبين الطاهرين رضوان الله عليهم اجمعين والى روح ابينا ادم وامنا حواء والى من تناسل منهما من انبياء والمرسلين صلوات الله عليهم اجمعين وصدقه جاريه من جنابه المكرم ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾والى روح من كان سببا للتلاوة الشريفه لأجلهم وجهتهم وانت اعلم بهم منا خاصه وعلى قبورهم منك نورا نازلا يا مولانا يا رب العالمين واوصل ثواب هذه التلاوة منا اليهم واجعله نورا نازلاً عليهم وافسح اللهم لهم في قبورهم مد بصرهم وارحمنا اذا سرنا اليهم ولسائر مقابر المسلمين ولنا ولوالدينا واستاذنا واستاذ استاذنا ومشايخنا ولمن احسن الينا ولمن له حق الدعاء علينا ولمن اوصانا واوصيناه بدعاء الخير ولعبيدك الحاضرين السامعين ولكافة اهل الايمان اجمعين

اللهم تقبل هذا المولود من صاحبه وعامله فلان ابن فلان وتقبل ممن صار سببا لقراءة المولود النبي الكريم اللهم لا تبدع لنا في مقامنا هذا ذنبا الا غفرته ولا هما الا فرجته ولا دينا الا اديته ولا غائبا الا رددته ولا شقيا الا اسعدته ولا سائلا الا اجبته ولا مريضا الا شفيته

اللهم افضي علينا من بركات مولد حضرة رسول الله واحشرنا يوم القيامة مع حضرة المصطفى واحفضنا من سوء الخاتمه وعذاب القبر وضغطته وظلمته ووحشته وهيبته وسائر الاسواء واسقينا من حوض حضرة رسول الله وثقل ميزاننا واجزنا على الصراط واجّرنا من نار جهنم وسلاسلها واغلالها وحياتها وعقاربها وزقومها وسمومها وزمهريرها وادخلنا برحمتك الجنة مع النبين والصديقين والشهداء والصالحين وتوفّنا مسلمين وادفع عنا شر الظالمين برحمتك يا ارحم الراحمين سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين وبشرف سورة الفاتحه اللهم صلي على سيدنا محمد وعلى ال سيدنا محمد.

تێبینی:

سوودی له هەندێ وتەکانی مەولوودنامەی مەلا عەبدوڵلاّ جەلی زادە بەتایبەتی لەبەشی دووەم و سێیەم دا وەرگرتوون.



لەڕاستەوە شێخ جەمال، شێخ ئەنوەر بەرزنجی



لەڕاستەوە شێخ جەمال، شێخ ئەنوەر بەرزنجی، ئەرێز ئەحمەد، ئەحمەد شێخ جەمال



لەڕاستەوە: شێخ جەمال و کاک جەوادی خاڵە شێخ باقی



شێخ جەمال، درەخشان کچی شێخ جەمال



لەڕاستەوە شێخ موحسین کوڕی شێخ جەمال، شێخ جەمال بەرزنجی




لەڕاستەوە د.کەمال مەعروف، شێخ موحسین، شێخ جەمال، درەخشان

«(هه‌لبه‌ستێک له‌هه‌لبه‌سته‌کانی جه‌مال سه‌یدئه‌حمه‌دی به‌رزنجی (کۆلایی)»

خۆشی وسه‌نێرانه له کوردستانه
رۆژی سه‌ربه‌ستی قاره‌مانانه

کوانێ ئه‌وانه ره‌فیقی کار بون
کوانێ ئه‌وانه‌ی ولات فرۆش بون
کوانێ ئه‌وانه‌ی که لیان ئه‌دوێشی
کوانێ ئه‌وانه‌ی که‌وا زۆردار بون
بۆ کوێ هه‌لاتن کوانێ له‌کوێیان
پیاوی خوێن رێژ وخائن وبه‌دکار
هێزی ئازادی پشتیان ئه‌شکێنی
ره‌با بجنلێن له ژێری مه‌ینه‌ت
ره‌با برێژن ئه‌شکی ئه‌دامه‌ت
بۆ هه‌رکی بچێ بێشک رووره‌شن
[illegible] به‌رگ تازه له‌به‌رکه‌ن
میلله‌ت هوشیاره دوژمن ئه‌ناسی
[illegible] بۆ رێگه‌ی چه‌وت
برای پێشمه‌رگه‌ی دلێری مه‌یدان
قه‌د له‌بیرناچێ یادی ئه‌و مارنه
ئه‌و شه‌هیدانه‌ی خۆیان فیداکرد
واجبی گه‌لی کوردیان ئه‌دا کرد
خۆیان به‌خت کرد له‌بۆگه‌لی کورد
ئه‌و شه‌هیدانه قه‌د ناڵێن مردون
مردوی زیندونه له‌مێژوی به‌شه‌ر
به‌خوێنی پاکی سووری ئه‌وانه
ئه‌و شه‌هیدانه تاجی سه‌رسه‌رن
ئه‌ی شه‌هیدانی رێگه‌ی ئازادی
دلتان گوشادبێ هه‌موتان بێ غه‌م
برایانی به‌رێز ئه‌ی کورد په‌روه‌ران
شۆرشی گه‌لمان شه‌ش سالی پڕ حیز
هه‌زاران ژن و پیاو تیاکوژراون
چه‌ند هه‌زار گوندی لێ خراپ کردین
(جه‌مال) له‌یه‌زدان ئه‌پارێته‌وه
هه‌تا هه‌تای به‌خۆشی بژین

جه‌ژنی شیرانه رۆژی مه‌ردانه
رۆژی گوشادی پاله‌وانانه

له‌گه‌ل گه‌لی کورد خائن وخواربون
بۆخوێن رژاندن دائم له‌جۆش بون
خوێنی میلله‌تی کوردیان ئه‌نۆشی
له‌کوردستانا خاوه‌نی کار بون
چۆن رزگار ئه‌بن له‌نێو نشتمان
له‌ده‌ست گه‌لی کورد چۆن ئه‌بن رزگار
ریشه‌وره‌گه‌زیان له‌بن ده‌ردێنی
له‌نێو قوراوی پیسی خیانه‌ت
تازه به‌سه‌رچوو ده‌وری عه‌داله‌ت
له‌خۆشی ژیان له‌مه‌و بێ به‌شن
ناتوانن چیتر خۆیان وه‌ده‌رخه‌ن
زۆر شاره‌زایه له‌ده‌نگوباسی
ئیتر به‌کورتی گه‌لمان سه‌رکه‌وت

بۆتان به‌یان که‌م باسی شه‌هیدان
چه‌ند به‌نرخن له‌م نشتمانه
جهادی حه‌قیان له‌رێی خوداکرد
ره‌نگی شۆرشیان به‌رێ دوناکرد
روحیان قوربانی خاکی وه‌ته‌ن کرد
هه‌تاهه‌تایی نامرن زیندون
مێژوی ژیانیان خرایه ده‌فته‌ر
به‌رله‌مان دانرا له‌م کوردستانه
له‌بۆ قه‌ومی کورد سایه‌وسێبه‌رن
سه‌ربینێنه‌وه بنون به‌شادی
ئامانجه‌کانتان واهاته به‌رهه‌م
ژنانیانی گه‌لی ئه‌ی خوێنده‌واران
هه‌زاران که‌بچو منالی تێ چو
هه‌زاران شه‌هید له‌م خاک نێژران
[illegible]
ئالای کوردستان بلاوێته‌وه
له‌کوردستانی قه‌شه‌نگی ره‌نگین

مەرثیەیەک لەلایەن سەید جالی سەعادەی بەرزنجی بۆ گیانی کۆچکردووی خوالێخۆشبو شێخ لەطیف شێخ رەزای بەرزنجی لە رۆژی ٢٢/٥/١٩٨٦ -١ وەفاتی کرد لە ٢٧/٦/١٩٨٦ بۆی دانراو دە لەهەولێر

لەرۆژی بیستی شەوالی هەزارو چوارصەدو نۆ بو
جەنابی شێخ لەطیف کۆچی دوایی کرد بەرەحمەت چو
لەدانیشتوانی کەرکوک بو گەلێ پاکو مونەوەر بو
لەنێو ئەم شارەدا پیاوێ بەدینو بیرو باوەر بو
لە شەرعو دینی ئیسلامی زیرەنگو ژیرو هوشیار بو
لە شعرو وێژەو ئەدەبیاتو زوبانی دولبەرویار بو
لە بۆریی ژینی ئازادی کولێکی نیشتمانی بو
لەبۆیەرزی وولاتیشی خەریکی بەهێمارێ بو
ئەگەر ئەیدیت بەچاوی خۆی ئەوەی فکرو مەرامی بو
ئەجەل دهات بۆ روحی پاکی شەهادەت دواکەلامی بو
ئەهالی لشترە حیماوەی سەرا پاشێوشەیدا بو
بەچاری شینو واوەیلا لە بۆ ئەم زاتە پەیدا بو
وەفاتی کرد ئەوا لوتفی لە نەسلی شاهی خاتەم بو
لەنێو ساداتی بەرزنجی سەرى بو عەینی حاتەم بو
لە بۆ قەومو کەسوکاری دەکورە شالی سیبەر بو
لە ناو کۆمەل لە کوردوستان ئەوارۆیشتوتیپەر بو
ئەکانو مەرکەزو جێگەی بلندو بەرزو بالا بو
لەنێو عالەم دیار بو ئەو شعارو رەمزو ئالا بو
زوبانی کوردیو تورکی عەرەب هەم فارسی زانبو
بەلێ هەرچواری زانیوە جیاو فانۆسی کوردانبو
قسەی وەعزو نەصیحەتبو بەنرخو قەدرو قیمەتبو
رەفیقی کەم بو ئەم زاتە لەنێو خەلقی بەحورمەتبو
حسن شتاهی گلەزەردە کە ئەو بابیرە گەورەی بو
هەتا کۆچی لەدونیاکرد قەناعەت کارو پیشەی بو
لە ئرشادو طەریقەتدا خەلیفەی غەوسی بەغدا بو
مەلاو شێخو ئەدیبو هەزاران شعری دانابو
لەگەل شیطانو ئەفسیشی هەموکاتێ لە جەنگابو
گەلێ ایاتی قرآن و حەدیسیشی لەسینگابو
زوبانی حالی ( الحمد ولا الضالین) و ئامین بو
کەلامی خواو حەدیسی حەزرەتی طاهاو یاسین بو
لە بیستوسێی لە مانگی شێخ غەریقی رەحمەتی خوا بو
پیری ناوقەبرەکەی نوربێ بەباقی جەننەتی شابو
خوا رەحمی بەلوتفی کرد بەدینو بیرو زانابو

$$\frac{\text{خوا رەحمی بەلوتفی کرد بەدینو بیرو زانابو}}{٦٠ + ٢٦٢ + ٥٢٢ + ٢٢٤ + ٧٧ + ٢١٨ + ٦٧} = ١٩٨٦ \text{ زاینی}$$

اکۆچی لەدونیاکرد ژیانو عومری کوتابو

وەکومەلحەلغری روحی لەبوفیردەوسی اعلاچو
لەبۆلای جەدی خۆیی (أحمد) لەوێ مێوانی مەولابو

(جمال) مێژوی لەبۆداناو دەلێ شێخمە لوطفی ابو

$$\frac{\text{(جمال) مێژوی لەبۆداناو دەلێ شێخمە لوطفی ابو}}{٧٤ + ٧٢ + ١٠٥ + ٤٩ + ٩٦٥ + ١٤٢} = ١٤٠٩ \text{ کۆچی}$$

خودا لێی خۆش بولەزاتە کەلا مُ اللّه أمامی بو

برایان مردن دەرمانی نیە   کەرووی لێ کردی ئەمانی نیە

ئەوەی کوچی کرد جیهانی نیە   تاکو قیامەت ژیانەوەی نیە

ئەگەردە پرسن روح چۆنە چیە   بێ شك تەفسیر و بەیانی نیە

خوا نەبێ هیچ کەس ئاگادار نیە   لەزانینی روح خەبەردار نیە

لەشەوی نۆزدەی مانگی رەمەزان   رۆژی جمعە بو لەکاتی بەیان

داخی گرانم کاکە مەزهەر رەمان   کوچی کرد رۆیی لەبەسەر رووی جیهان

لەشاری کوهی هاتبوە دونیا   لەحەسولیر خوا ولیردیا وە فەنا

سالی سیو پێنج لەدایك بووە   لەبەر ئەوە زوو ئیشی کوچی کردووە

بەبیاوهەشت سال بولەدونیا عومری   بەرز و بەرێز بو جور مەتو قەدری

گەردەنی خوایە خوش و ئازاد بێ   رۆژی قیامەت بە بەهەشت شاد بێ

تەمەنی درێژی بو برایە کانی   بۆ کور و کچو و بۆ خزمە کانی

هەزاران سەلام لەروحی پاکی   لەئالوبەیتو لە باب و دایکی

لەو کە سانەشی بێ لوی بەپرۆشن   غەمو بەزارە مال بوده نوێشن

(جەمال) لە بۆئەو دل پرێشارە   لەتاو مەرگی ئەو وا بێ قەرارە

بەرەحمەت خودا بیبا بۆجنان   لای باپیری خوی شای ئاخر زەمان

٦٦٥   ٦١١   ١٥   ١٢٢    ٢٦٦   ٦٠٦   ٢١١   ٨٠٢   ١٠٣

| | |
|---|---|
| ٦٦٥ | ٢٦٦ |
| ٦١١ | ٦٠٦ |
| ١٥ | ٢١١ |
| ١٢٢ | ٨٠٢ |
| | ١٠٣ |
| ١٤١٢هـ | ١٩٩٢ |

دانەر جەمال سید احمد بەرزنجی

١٠/٤/١٩٩٢

( تخمیسی غەزەلێکی صافی لەلایەن جمالی سید احمدەوە )

تۆ یارەکی نازداری لەناو دڵ و عەجەمم دا   وەک غونچەیە گوڵی ئاڵی لەنێو باخ و لەچەمەم دا
دڵ بۆ تۆ برینداره بە ڕێشانە لەغەمم دا   گوڵ ناری ڕوخسارت ڕەشکی بە گوڵزاری ئیرەمم دا
دوو تاقی برۆت تەختی لە محرابی حەرەمم دا

زۆر بەرزی لە نێو عالەمی شیرینە کەلامت   بە وێنا و نیشانەی کە هەتا بەرزە بە قامەت
ئەو عالەمە وەستاوە لە ڕێگە و لە سلامەت   هەستاوی کە هەڵسەستاو و قیامەت بە قیامەت
ڕۆیبوو کە ڕۆیبوو دەمم لەم وەصوورەدەم دا

ساقی لە غەمانت دڵەکەم قەرنی بوو مرتاح   بۆ شەمعی وصالت لەگەڵ ئەم وەکو سیاح
ڕۆیشتی بە بێ باکی لەگەڵ کۆمەڵی أفراح   ڕوح سەستە لە ڕاحی تو لەنێو عالەمی أرواح
باتین لە (بلی) دایە و زاهیر لە (نعم) دا

جانا وەرە بنوارە بە دوو چاوی خوسارت   ئەو وردە وردە لە دڵما یە لە تازی گوڵی نارت
سووتاوە لە بۆ غونچەیە گوڵی خەصڵی بە دارت   دڵ واڵە بە ڕێ زاری وەکو نوکتەیی زارت .
گاهێ لە وجودایە و گاهێ لە عەدەم دا

دێوانە یە بێ تۆ دڵە کەم بە پەلی ئەگیوە   بە سرا و ئە سیری کەمەرە و سینە و سێوە
گیرۆدە یی تو للابی موژانوورە مو لیوە   بۆچی نەگری دڵ لە سەرئەم شێوە بە شێوە
ڕاحەبەسە لە نێو چینی چەمی بە ڕچەمی چەمم دا

مەنەگراوی دەمت شیرینە وەک شەرابە تەنۆشیم   ڕوو چاری هەوای کردموو بێ تۆ نیە خۆشیم
وا بە ڕێی غەمو محنەتی دڵداریە بۆشیم   گە ڕێتو بە ڕخۆشی بپرسێ لە نە خۆشیم
حور القدم ڕوح لە قەدەم گاهی قیدەم دا

خاڵت (حجر الأسود)ە ماچیشی حەلالە   زیارەتی کەعبەکا حاجی تەوافیشی بە تاڵە
ڕووی کردە (صفا و مروة) جوالی عەشق و وصالە   صافی لە بەرئە وخاڵەیە خاڵی لەخەتە یا لە
یاکێمی بە زۆر دایەوە یا زۆری بەکەم دا

دانەر
جمال سید احمد کویی
لە ساڵی ١٩٨٧ لە هەولێر

( غەزەلی هێمن مهابادی بە (جمال) کردوتیە پێنجی )

ئەی وەتەن بۆ میللەتی کورد صاف و بێگەردم ئەمن
سەنگەری سەختو قەلاتی ئاسن و بەردم ئەمن
رابەری رێگەی خەباتی میللەتی کوردم ئەمن
«گەرچی توشی رەنجبەری بوم حەسرەتو دەردم ئەمن»
«قەد لەدەس ئەم چەرخە سپلە نابەزم مەردم ئەمن»

چەنە تەمن خاکی کوردە غەیری ئەو حاکم نیە
گەر لەدەس بروا ژیان و نان و خۆراکم نیە
هەردو چاوم کوێرە بێ ئەو نوری روناکم نیە
«من لە لۆمەو تانەو و زنجیرو دار باکم نیە»
«لە تلەتم کەن بم کوژن هێشتا ئەلێم کوردم ئەمن»
کوردم و کوردێکی مەردم هەربەسەربەستی ئەژیم
خاکی کوردستانە خۆم نادەم بە جەنات النعیم
ئەی برادەر خۆت ئەزانی چیم ئەوبومەو دالی چیم
«عاشقی چاوی کەژال و گەردەنی پڕخال نیم»
«عاشقی کێو و تەلان و بەندەنو بەردم ئەمن»
من کە سەربازێکی کوردم وابە کوردی پێت ئەلێم
هەوڵ ئەدەم بۆ نیشتمان تابێ لە بەر دوژمن هەلێم
پارە پارەم کەن لە رێی سەختی ژیان هەر حەق ئەلێم
«گەر لە برسان ولو بەربێ بەرگی ئەمرۆ رەق هەلێم»
«نۆکەری بێگانە ناکەم تالە سەر هەردم ئەمن»

شیعری هێمن زۆر جوانە کەدەلێ کوردم ئەمن

٥٩٠ + ١٠٥ + ٢٧٨ + ٧٤ + ٢٧٠ + ٩٦ = ١٤١٢ هـ

کوردی ئیرانیم خوداناس و موسلمانم ئەمن
والە شوێش دام لە بۆ کورد ئەی (جمال) شاعرم ئەمن
«من کە ناسراوم بە (هێمن) لە مهابادم ئەمن»
«شارەکەی من کوردنشینە خەلقی ئیرانم ئەمن»

مرثیه بوگیانی خوالی خوشبو شیخ معروفی هەرەجەی کوری شیخ عبدالکریمی کویسنجه بول سالی ١٩٢٩
میلادی بەرانبەر سالی ١٢٤٨ هجری وەفاتی کردوە. لەلایەن سید عبالی سید حمدی برازایەوە دانراوە.

---

کە شیخ مەعروف وەفاتی کرد دلوجان پر لە ماتەم بو
لە بەخشینو سەخاوەت ئەوگەلی زایا تر لە حاتەم بو
عزیز و موحتەرەم بو شیخ لە نەسلی شاهی خاتەم بو
لە ئالی ئەحمەدو یاسین محمّد فەخری عالەم بو
لە جەرگی فاطمەی زەهرا و حسینی لاوی أعلا بو
لەکوردولە کوردوستان مەقامی شیخی أعلا بو
کوری عبدالکریمی بو ئەویش خاوەنی کەرامەت بو
لە ارشادو طەریقەتدا وەلی دونیاو قیامەت بو
حەرەجە گوندو سوکنای بومەکانی شیخی بالا بو
هیدایەتی تەکیەکەی پربو لە عالەم جێنی سەلا بو
لە بۆمەلی مەشاکل زیرەکو هوشیارو دانا بو
رەفیقی کەم بووزاتە بە مەعلوماتو زانا بو
لە بۆ ختمەی شەو و رۆژی کەلامی خوای لە چنگا بو
~~[illegible]~~ ئەگەرچی ئەو دەموقورئانی خوای گەورە [illegible]
~~[illegible]~~
رجالی دینو دونیا بو غەریقی رەحمەتی خوا بو
چووە لای جەددی خۆی ئەحمەد بە باغی جەننەتی شابو
وەکو مەل هەلفری روحی لە عرشی وەحدەت ئاوا بو
هەزار رەحمەت لەگۆری بێ لە دونیا عومری کوتا بو
هەمو دەم مل کەچی ئەمرو کەلامی خوای تەعالا بو
(جەمال) بۆتێ لە مێژو بدا ئەلێ شیخیە ئالا بو

جەنابی شیخ وەفاتی کردو چو میوانی مەولا بو
٧١ + ٩١٠ + ٥٠٢ + ٢٩٠ + ٩ + ١١٧ ... ٩٠ = ١٩٢٩ میلادی

لەناو گەلیا نەما رویی شمارو رەمزو آلا بو
٩٢ + ٦٠ + ٩٦ + ٢٢٦ + ٥٧٦ ... ٢٥٨ ... ٤٠ = ١٢٤٨ هجری

| ٩٢ | ٧١ |
|---|---|
| ٦٠ | ٩١٠ |
| ٩٦ | ٥٠٢ |
| ٢٢٦ | ٢٩٠ |
| ٥٧٦ | ٩ |
| ٢٥٨ | ١٠١٧ |
| ٤٠ | ٩٠ |
| ١٢٤٨ هجری | ١٩٢٩ میلادی |

دو شعری شێخ عبدالله شێخ مصطفی نقشبندی
جمال سید احمد بەرزنجی تخمیسی کردوە.

١- بایەکەی زستانی دوری هەرکە هات دڵ بوگەڵەک
وەرگە راهەرچەندی کردم وەرنەگیرێتن کە لەک

٢- گەر بەهاری رۆژی دیدارت بهێتن گیا نەکەم
لۆت دەلێم کوندەی کە لەک چون کە تنە بەردم چەند پەلەک

---

«یەکەم»

سەیری ئەم دەورو زەمانەی کەن وەکو مرخوفەلەک
عالەمی أمیرۆ کە بیشتە مانگ و ئەستێرەو فەلەک
بەفرە زریانە دەباری تەزرەوەک کوچکوکەلەک
بایەکەی زستانی دوری هەرکەهات دڵ بوگەلەک
وەرگەراهەرچەندی کردم وەرنەگیرێتن کە لەک

«دووەم»

من لە دوری تۆ هەموو دەم گریەوو زاری دەکەم
مۆژ وشە و چاوم لە رێتە چاوە نواری تۆ ئەکەم
چونکە بێی تۆ خەو لە چاوم ناکەوێتن چاوەکەم
گەر بەهاری رۆژی دیدارت بهێتن گیانەکەم
لوت دەلێم کوندەی کەلەک چۆن کە تنە بەردم چەند پەلەک

جمال سید احمد بەرزنجی
لە هەولێر
١٩٩٠/٥/٢١

(غەزەلی شێخ جلال شێخ جمیل (جمال) کردویتیە پێنجی)

حەبیباچی بلێم من نیە چارە     دڵم دائم لە بۆ تۆ بێ قەرارە
خەیاڵی تۆ چاوە کاڵت وادیارە     ((هەڵستاوی لە خەو چاوت خومارە))
((دڵت کردم بە غەمزە پارە پارە))

بە خەندە و پێکەنینو چاوی جادوت     بە غونچەی لێوی ئالو خاڵەکەی روت
برینداری بە شمشیری دوو ئەبروت     ((لەوی لە علت هەموی قوتە یا قوت))
((کە قوتە بۆ دڵی من وادیارە))

بە دوو ئەبروی رەش و دوو چاوی بازت     بە رەنگ و روومەتو گەردەنی قازت
بە بیرو باوەر و دونیا نازت     ((بە غەمزەی شیرین و لەنجەی بە نازت))
((گوزەر خەرمو بە سەرێکە دووبارە))

لە دووری بەژن و بالابەرزەکەی خۆت     لە بۆ دیداری لێوە ئالەکەی خۆت
نەخۆشە کەوتووە دلدارەکەی خۆت     ((دەبینی خادمی دەرگانەکەی خۆت))
((لە دووری تۆیە بێ صەبرو قەرارە))

بەرێشانم بە حەقی زاتی یەزدان     [illegible] تحی نعمە وتی گەیلان
(جمال) دەردی گرانە بێکە دەرمان     ((بکە رەحمی بە حالی (نووری) قوربان))
((فەقیری دەرگەتە چاری نەچارە))

مرثیە بۆ گیانی پاکی شێخ مەعروفی هەرچەن کوری شێخ عبدالکریمی کوسنجە خوالێ خوش بێ لە ریکەوتی سالی ١٩٢٩ میلادی مقابل سالی ١٣٤٨ هجری دەکات لە لایەن سید جلالی سید احمد برازاوە دانراوە لە سالی ١٩٨٧م

~~کە شێخ مەعروف وەفاتی کرد دڵمان پڕ لە ماتەم بو~~
لە بەخشینو سەخاوەت ئەوکەلێ زیاتر لە حاتەم بو

عزیزو محتەرەم بو شێخ لە نەسڵی شاهی خاتەم بو
لە ئالی أحمدو یاسین محمّد فەخری عالەم بو

لە جەرگی فاطمەی زهراو حسێنی لاوی أعلا بو
لە ناو کوردو لە کوردوستان مەقامی بەرزو بالا بو

کوری عبدالکریمی بو ئەویش خاوەنی کەرامەت بو
لە ارشادو طەریقەتدا وەلی دونیاو قیامەت بو

لەلێ مەعروف لە شەرعو دین گەلێ هوشیارو دانا بو
رەفیقی کەم بو ئەو زاتە بە مەعلوماتو زانا بو
لە بۆ اصلاحی نێو عالەم گەلێ مەشهورو مەلا بو
هەموو قورآنی خوای گەورەی بە ماناوە لە سینە بو
هەرچەندە مەسکەنی ئەو بو کە جێگەی شێخی بالا بو
هەموو دەم تەکیەکەی پڕ بو لە عالەم جێی سەلا بو
بە خێرو کردەوەی چاکی بە باخچەنەی شابو
چووە لای حەزرەتی خوای أحمد غەریقی رەحمەتی خوا بو
وەکو مەلهەفی روحی لە عەرشی وەحدەت ئاوا بو
هەزار رەحمەت لە گۆڕی بێ لە دونیا عومری کوتا بو
هەموو دەم ئەمل لە جێ ئەمرو کەلامی خوای تەعالا بو
(جەمال) بۆ بێ لە مێژووی ئەولێ شێخیمە ئالا بو
جەنابی شێخ وەفاتی کردو چو میوانی مەولا بو
٧١ + ٩١٠ + ٥٠٢ + ٢٢٤ + ٩ + ١١٧ + ٩٠ = ١٩٢٩ میلادی
لە ناو گەلدا ئەما رۆیی شعارو رەمزو آلا بو
٩٢ + ٦٠ + ٩٦ + ٢٢٦ + ٥٧٦ + ٢٥٨ + ٤٠ = ١٣٤٨ هجری

هەولێر سالی ١٩٨٧م
جمال احمد عبدالکریم

ئەی مەرگی هەرتۆی زەمین تارمکەی
بەشەر ... عاجزو دلغمبارئکری
عالەم لە ژینی خۆی بێزار ئەکەی
براو خزموکەس پەرێشان ئەکەی
شاهو گەدایان بێ سامان ئەکەی
عالەم بەجاری هەراسان ئەکەی
رۆژی یەکشەمو سەعات کاتی دوو
لە تەکیە ماوەتا بەیانی زوو
رۆژی دوشەمو سەرلە بەیانی
لە سەرئەشکەوتی شێخ سولەیمانی
لە بۆناشتنی لای خزمەکانی
بە رەفەو زکرو شوکرانەی باری
نێژرا جەنازەی لای کاکەئەنوەری
مال ئاوای کرد لە هەمو خزمانی
غەوثەی عەزیزو خۆشەویستم رۆ
برای مەلا کاکەو کاک عەزیزم رۆ
برای جەعفەرو کاک جونەیدم رۆ
برای کەریمی نەوجەوانم رۆ
باوکی بەرەحمی کاک ئازادم رۆ
ئەیبوزانای نیشتمانم رۆ
هوشیار روژیرو زۆرئەمینم رۆ
رۆژی دوشەم بولە بۆسەفەرچو
مانگی مەولودبو لە رۆژی یازدە

| له جێژنەی | مەولود | غەوثە | کوچی کرد |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٢٠ | ٩١ | ١٥١٦ | ٢٦٢ |

«جمال» لە یەزدان ئەپارێتەوە
سەفەرکردنەکەی بیتە رەحمەت
لە رەحمەتی خۆی بێبەشی نەکا

١٢٠
٩١
١٥١٦
٢٦٢
١٩٩٠ م

٦٠٧
٤٧٦
١٢٢
٢٠٦
١٤١١ هـ

جگەرلە تالم تووریندار ئەکەی
کارەساتیکی بێ شمار ئەکەی
تاکو قیامەت هەردەم کار ئەکەی
منال هەتیوو سەرگەردان ئەکەی
رۆژێ هەزاران مال وێران ئەکەی
هەموروح لەبەرێ گیان ئەکەی
بابە غەوثەمان وەفاتی فەرموو
شەوێ میوانی مەلوثانی بوو
چوینە هیرانی سەرقەبرستانی
لای کاک عبدالله و صافی هیرانی
لە گورستانی باپیرەکانی
چاو بە فرمێسکو گریانو زاری
براگەورەی خۆلیو کاکە جەعفەری
لە مەلاو شێخ و ئاغاو دەرویشان
پورزای بەقەدرو بەقیمەتم رۆ
برای کاکەئەنوەری زۆر بەریزم رۆ
خۆشەویستەکەی کاک حمیدم رۆ
شێخی عەزیزوخانەدانم رۆ

باوکی فرهادو کاک دلشادم رۆ
ئازاناوی «سوزی» شاعرانم رۆ
عبدالقادری زور بەدینم رۆ
تأریخەکانی هەردوکی دەرچو
سالی هەزارو چارصەدو یازدە

| خوا | بیدانەجات | بۆجنانی | برد |
| --- | --- | --- | --- |
| ٦٠٧ | ٤٧٦ | ١٢٢ | ٢٠٦ |

دەرگەی رەحمەتی بۆبکرێتەوە
قەبری ئاریکی بۆ ببێتە جەنەت
بەقەسروباغی بەهەشتی ساکا

دانەر جمال سید احمد بەرزنجی
لەهەولێر ٦/١٠/١٩٩٠

# ملخص باللغة العربية

شــيخ جمال ابن الشيخ سيد احمد ابن الشيخ عبدالكريم البرزنجى من سلالة الشيخ حســن الگلزردي النودهي البرزنجي، ولد في مدينة كويســنجق ســنة ١٩٢٥ من عائلة دينيــة عريقــة فــي الثقافة والأدب، ممــا أتاح له ذلــك الاطلاع بشــكل واف على اللغات الفارسية والعربية، الشيخ جمال معجب بعدد من الشعراء الكرد امثال طاهر بگى جاف، هيمن، حاجي قادر كويي، دلزار، حسيني، انور البرزنجي حيث تطرق في اغلب اشعاره الى مواضيع الغزل والشــعر الوطني والسياســي، تتميز ببســاطة اسلوبها الشعري، فقد اســتعمل الاوزان العروضية والهجائية في اشعاره، والحفاظ على وحدة القافية والقافية المزدوجة. أما في المجال النشر الأدبى فلو مولود نامه.

// Abstract

Sheikh Jamal is the son of sheikh sayyid Ahmed, son of sheikh Abdul-karim Berzinji, from the family of sheikh Hassan Glazardy Al-Noudhi Al-Berzinji, He was born in 1925 in Koysinjaq, from an ancient religious family, Well- Versed in Culture and literature. That fact helped him abundantly to .have a wide Knowledge in Persian and Arabic languages.

Sheikh Jamal was in flounced by a number of Kurdish poets as Tahir Begi Jaff, Haji Qadir Koyi, safi, Hemin Mukriany, Dilzar, his own father Husseini and his brother sheikh Anwer Berzinji. The Topic of his poetry are about love, death Natiendl and political themes.

The style of his poetry are simple, but poetically deep. He made use of traditional Arabic and Syllabic metres in his poetry, preserving the unity of rhythm and couplets.

But in the field of literary prose, he has a Mawludname (Prophets Birth Prose).

# پێرست

## ئەم چاوە جوانەی

ئـەم چـاوە جـوانـەی کـەتۆ هـەتـە دوژمـنـی دینە
خـوێـنـاوییـە جـەرگـم بـەدو ئـەبـرۆیـی هیلالی

گرتویە سـەرو مـاڵ و دڵ و سـەتـوەت و ڕوحم
یـەک شیوە پیاڵەیەکی لـەسـەر چاوەیـی کالی

کـاکـۆڵـی لـەسـەر عـارزی تـابـانـی تـرازانـد
پەید بو لـە هـەر مەملەکەتێ سیحری حەلالی

بـادامـە لـەبی عـەتـرە خـەتـی نێرگسە چاوی
خـاپـوورە دڵـم بـۆ خـەتـو خـاڵانـی غـەزالـی

(جـەمـاڵ) کـەپـڕوکـاوە لـەتـەنـدوری جەماڵت
شـادی کـە مـاچێکی دەرێ بیـخـەرە ویسالـی



چاپخانەی ڕۆشنبیری

٢٠٠٠ دینار